چاپی سێیەم

إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتْ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ كِتَٰبًا مَّوْقُوتًا

# فەزڵی نوێژ

و کاریگەریی
لەسەر
پەروەردە و تەزکییەی نەفس



مامۆستا شێخ ئیبراهیم سارانی




ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا

هەنگاوێك بەرەو ڕاگەیاندنێكی كوردیی ئیسلامیی هاوچەرخ



ناوی كتێب : فەزڵی نوێژ و

كاریگەری لەسەر پەروەردە و تەزكیەی نەفس

نووسەر : ناصح ئیبراهیم سازانی

هەڵەبڕی : شیرین كەریم

نەخشەسازی بەرگ : عیماد عبدالقادر

تیراژ : (١٠٠٠)دانە

نۆبەی چاپ : سێهەم بەدەستكاریەوە

بەهاری ٢٠٠٩

ناونیشان

ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا

سلێمانی – شەقامی میسیۆمیتران

نزیك زانكۆی سلێمانی

07703587100

07501069589

07480134669

ara.m@hotmail.com

ژمارەی سپاردنی (٧٥١)ی ساڵی (٢٠٠٧)ی دراوەتێ

# فەزڵی نوێژ و

## کاریگەریی لەسەر پەروەردە و تەزکیەی نەفس

**نووسینی**

ناصح ئیبراهیم سازانی

چاپی سێهەم بەدەستکاریەوە

١٤٣٠ ك - ٢٠٠٩ ز

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتۡ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ كِتَٰبٗا مَّوۡقُوتٗا﴾

النساء: ١٠٣

# پێشکەشە:

۞ بە باوك و دایکم و هەموو خانەوادەکەمان.

۞ بە بەڕێز مامۆستا شێخ محەممەدی سازانی

خوا لێی خۆش بێت.

۞ بەو مامۆستا بەڕێزانەی بۆ خوێندن و

نووسین یارمەتییان دام.

۞ بەو موسڵمانانەی کە دەیخوێننەوە و بەپێی

توانا کاری پێ دەکەن



# پێشەکی

إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستهديه، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا، ومن سيئات اعمالنا، من يهد الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادى له، وأشهد أن لا اله الاالله وحده لا شريك له، واشهد ان محمدا عبده ورسوله.

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمویت:﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتۡ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ كِتَٰبٗا مَّوۡقُوتٗا﴾ النساء: ۱۰۳. واتە: بە ڕاستی نوێژ هەمیشە لەسەر ئیمانداران فەرزێکی کات بۆدیاری کراوە.

نوێژ لە دوای ئیمان لە هەموو ئەرکانەکان زیاتر گرنگی پێدراوە، نوێژ میعراجی موسڵمانە، گەورەترین سورەت لە نوێژدا دەخوێنرێت کە فاتیحەیە ڕوکنێکە لە ڕوکنەکانی نوێژەکە، ماناو مەبەستی هەموو قورئان دەگەیەنێ، دوعایەکی شیفا بەخشە، نوێژ گەورەترین کردەوەی جەستەیە، کۆڵەکەی دینی ئیسلامە، حەوانەوەیە بۆ دڵ و دەروون، پاك و خاوێنی یە، بەرگریکەری تاوانە..

پێغەمبەری خواﷺ لە دوا ساتەکانی ژیانیدا لەبەر گرنگی و گەورەیی نوێژ بوو دەیفەرموو: (الصَلاَةَ! الصَلاَةَ!..)[1]. واتە: نوێژەکانتان! نوێژەکانتان!. ئەوە دوا وەسیەت و ئامۆژگاری بوو بۆ هاوەڵە بەڕێزەکانی، فەرمانی پێکردوون بە پاراستنی نوێژەکانیان.

هەروەها لە نەخۆشی ماڵئاوایدا کە تایەکی زۆر تینی بۆ هێنا بوو تا چوار جار دەستنوێژی گرت، ویستی بڕوات بۆ نوێژی جەماعەت دەکەوت و بێهۆش دەبوو، کاتێك دەهاتەوە سەرخۆ دەیفەرموو: (أصلى الناس) ئایا خەڵك نوێژیان کرد [2]!. ئەمانەش بەڵگەی ڕوون و ئاشکران بۆ گەورەیی و گرنگی پلەو پایەی نوێژ.

---

(۱) صحيح سنن أبو داود: (٤٢٩٥)، وانظر الإرواء: (٢١٧٨).

(۲) أخرجه البخاري: (٦٨٧)، ومسلم: (٤١٨).

پێغەمبەری خواﷺ هەرکاتێك توشی بەڵاو ناخۆشی ببوایە هانای بۆ نوێژ دەبرد و بانگی بیلالی دەکرد و دەیفەرموو: (أقم الصلاة يا بيلال، أَرِحنا بها)[1]. واتە: ئەی بیلال! هەستە بانگ بدەو قامەت بکە با بەکردنی نوێژەکان دڵخۆش و ئارام بین.

نوێژ ڕووناکی چاوی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، مایەی حەوانەوەی گیانی بوو.. نوێژ مایەی سەرفرازیی و سەرکەوتن و فراوانی ڕزق و ڕۆزیی و بەختەوەری یە، هۆی کەفارەت و شۆردنەوەی گوناه و تاوانە.

نوێژ گەورەترین فەرمانی خودایە، ڕوکنی دووەمە لە ڕوکنەکانی ئیسلام، لە ڕاستیدا چاك بوونی دەروونەکان لە چاککردنی عەقیدە و ڕێك و پێك بەجێ هێنانی نوێژەکانەوە دەست پێ دەکات، چونکە نوێژ ئاوێنەی کردەوەکانی موسڵمانە..

نوێژ یەکەم شتە لە قیامەتدا پرسیار و موحاسەبەی لەسەر دەکرێت، هەرکەسێ نوێژەکانی ڕێك و پێك ئەنجام دابوو ئەوا سەرکەوتوو و سەرفرازە، ئەگەر واش نەبوو خوا پەنامان بدات سەرەنجامی دۆزەخ و سەرگەردانییە.

نوێژ عیبادەتێکی زۆر کۆنەو هیچ دینێك نەناسراوە بەبێ نوێژ کردن، گەلانی پێشوو بە شێوەیەك لە شێوەکان نوێژ و عیبادەتیان کردووە، لە قورئاندا هاتووە ئیبراهیم عليه السلام داوای لە پەروەردگار کرد خۆی و نەوەکانی وا لێ بکات لەسەر نوێژکردن بەردەوام بن:﴿ رَبِّ ٱجْعَلْنِي مُقِيمَ ٱلصَّلَوٰةِ وَمِن ذُرِّيَّتِي ۚ رَبَّنَا وَتَقَبَّلْ دُعَآءِ ﴾ إبراهيم: ٤٠

هەروەها خوای گەورە بە موسای فەرمووە: نوێژەکانت بە چاکی بەجێ بهێنە تا هەمیشە منت لە یاد بێت: ﴿ إِنَّنِيٓ أَنَا ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعْبُدْنِي وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكْرِيٓ ﴾ طه: ١٤

فەرمانیشی کردووە بە پێغەمبەرﷺ ئەو قورئانەی کە بە وەحی بۆی هاتووە بیخوێنێتەوە بۆ ئوممەتەکەی و نوێژبکات:﴿ ٱتْلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيْكَ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ ۖ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ ﴾العنكبوت: ٤٥.

---

(١) صحيح سنن أبو داود: ٤١٧١ و صححه الألباني في المشكاة: ٢٥٣.

خەڵك لە هەموو شتێك وورد بوونەتەوە و بە دوای بەختەوەریدا دەگەڕێن، نازانن بەختەوەری و حەوانەوەیان لە نوێژدایە، کە نزیکترین شتە لێیانەوە بەداخەوە زۆربەیان فەرامۆشیان کردووە. وەك ئەو وشترە بەستە زمانە وان کە لە بیاباندا لە تینواندا خنکا بارەکەشی ئاو بوو!.

هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ چاك لە نوێژ گەیشتبوون دەیانزانی چەندە گەورەیە، دڵ و ئەندامەکانی جەستەیان لە نوێژدا ملکەچ بوو، هەڵس و کەوتیان هێمنانە و دامەزراو بوو، ڕەوشتیان بەرز و جوان بوو، بۆیە بوونە گەورە و پێشەوای مرۆڤایەتی.

با بگەڕێینەوە بۆ نوێژەکانمان بەراوردیان بکەین لەگەڵ نوێژەکانی پێغەمبەری خواﷺ و یارانی بزانین ئەوان چۆن نوێژیان کردووە، ئێمەش چۆن نوێژەکانمان ئەنجام دەدەین، پێویستە ئێمەش بەو شێوەیە عیبادەت و نوێژەکانمان بکەین، بەو گۆڕانکاریە دەگەینە چڵە پۆپەی ژیان و سەربەرزیی دنیا و قیامەت.

پێغەمبەری خواﷺ مامۆستاو سەرمەشقە بۆمان لە هەموو کاروبارێکدا چ جای لە پەرستشەکاندا.. بۆیە پێویستە هەنگاو بە هەنگاو شوێن پێی هەڵگرین و شوێن بەرنامە پیرۆزەکەی بکەوین: (صَلُّوا كَما رَأَيْتُمونِي أُصَلِّي)[1]. واتە: نوێژ بکەن بەو شێوەیەی کە من دەبینن دەیکەم.

لەبەر ئەم هۆیانەی سەرەوە بە باشمان زانی بە پشتیوانی خوای گەورە باسێکی (فەزڵی نوێژ و کاریگەری لەسەر پەروەردە و تەزکیەی نەفس) بەزمانی شیرینی کوردی بخەینە بەردەستی خوێنەرانی بەڕێز و خۆشەویست، داوایان لێ دەکەین لە دوعای خێر بێبەشمان نەکەن، بەتایبەتی دوعای لێ خۆشبوون و سەرفرازیی دنیا و قیامەت.

لە پەروەردگاری باڵادەست دەپاڕێمەوە لێمان وەربگرێت بە (صەدەقەی جاریە)و (زانستی سوود لێ وەرگیراو)، بمانخاتە ڕیزی ئەوکەسانەی کە نوێژەکانیان بە ملکەچی و بێدارییەوە بۆ خوا ئەنجام دەدەن.

إنه نِعمَ المَولى ونِعمَ النَّصير.

---

(١) رواه البخاري: (٦٣١).

# واتای نوێژ

نوێژ(الصَلاة) لە زمانەوانیدا: بەمانای نزاو پاڕانەوە دێت، بەڵکو بە یەك دەنگی زانایانی زمانەوانیش هەر بەو مانایە دێت.

نزاو پاڕانەوە لەخودا بۆ یارمەتی دانی موسڵمان بۆ بەجێ هێنانی ئەرکی بەندایەتی، لوتکەی ئەو داواکاری و پاڕانەوەیەش لە ئایەتی ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ دا دیاری دەدات، لەبەشی یەکەمیدا ئەرکی بەندایەتی ڕادەگەیەنرێت، لەبەشی دووەمیشدا داوای یارمەتی و کۆمەك دەکرێ..

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:﴿وَصَلِّ عَلَيْهِمْ إِنَّ صَلَوٰتَكَ سَكَنٌ لَّهُمْ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ التوبة: ١٠٣. واتە: دوعاو نزای خێریان بۆ بکە، چونکە بێگومان دوعاو پاڕانەوەی تۆ مایەی دڵنیایی و ئارامییە بۆ دڵ و دەروونیان.

* پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: (إِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا قَامَ فِي صَلَاتِهِ، فَإِنَّهُ يُنَاجِي رَبَّهُ)[1]. واتە: ئەگەر کەسێك لە ئێوە هەستا بە نوێژ کردن، ئەوە لە پەروەردگاری خۆی دەپاڕێتەوە.

مانای نوێژ لەشەرعدا: بەو گوفتار و کردارە دەوترێت هەر لە(الله اکبر)ی نوێژ دابەستنەوە دەست پێدەکات تاوەکو سڵاو دانەوەی دوای تەحیات خوێندن، لەگەڵ نیەتدا بە مەرج و ڕوکنە تایبەتییەکانیەوە.

* ئەبو هورەیرە ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ دَخَلَ الْمَسْجِدَ، فَدَخَلَ رَجُلٌ فَصَلَّى فَسَلَّمَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَرَدَّ وَقَالَ (ارْجِعْ فَصَلِّ، فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ). فَرَجَعَ يُصَلِّي كَمَا صَلَّى ثُمَّ جَاءَ فَسَلَّمَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ (ارْجِعْ فَصَلِّ فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ) ثَلَاثًا. فَقَالَ وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ مَا أُحْسِنُ غَيْرَهُ فَعَلِّمْنِي. فَقَالَ (إِذَا قُمْتَ إِلَى الصَّلَاةِ فَكَبِّرْ، ثُمَّ اقْرَأْ

---

(١) صحيح البخاري: (٤٠٥)، وفي صحيح الجامع: (١٥٣٨).

مَا تَيَسَّرَ مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ، ثُمَّ ارْكَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ رَاكِعًا، ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَعْتَدِلَ قَائِمًا، ثُمَّ اسْجُدْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ سَاجِدًا، ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ جَالِسًا، وَافْعَلْ ذَلِكَ فِي صَلَاتِكَ كُلِّهَا)[٢].

واته: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆشتە مزگەوت، پیاوێك هاتە ناو مزگەوت نوێژی کرد و پاشان چووە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و سڵاوی لێکرد، ئەویش وەڵامی دایەوە و فەرمووی: (ارْجِعْ فَصَلِّ، فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ). بگەڕێرەوە نوێژەکەت بکەرەوە چونکە تۆ نوێژت نەکرد.. تاسێ جار پیاوەکە دەگەڕێنێتەوە بەو شێوەیە، پاشان پیاوەکە دەڵێت: بەو کەسەی تۆی بەهەق ناردووە لەوە چاکتر نازانم، دەی تۆ فێرم بکە، ئەویش فەرمووی: کاتێك هەستای بۆ نوێژ نیەت بێنە و(الله اکبر) بکە پاشان چەندت بۆ ئاسان بوو لەو قورئانەی لەبەرتە بیخوێنە، پاشان بچۆ بە ڕکوعدا و هێندە بوەستە تا جەستەت لە جووڵە دەکەوێت و ئارام دەبێتەوە، پاشان بەرز بەرەوە تا بەتەواوی ڕاست دەبیتەوە، پاشان سەجدە ببەو هێندە بمێنەرەوە تا ئارام دەبیت، پاشان بەرز بەرەوە تا بە دانیشتوویی ئارام دەبیت، پاشان سەجدە بەرەوە و هێندە بمێنەرەوە تا ئارام دەبیت، بەم شێوەیە هەموو نوێژەکەت ئەنجام بدە.



(٢) صحيح البخاري: ٧٥٧.

# واتای سورەتی فاتیحە

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴿١﴾ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿٢﴾ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴿٣﴾ مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ ﴿٤﴾ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴿٥﴾ اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ ﴿٦﴾ صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ ﴿٧﴾﴾ الفاتحة: ١ – ٧.

لەبەر ئەوەی لای زۆربەی زانایان لێکدانەوەی واتای وشەکانی نوێژ لەناو نوێژدا پێویستە، هەروەها واجبە لە هەموو رکاتێکدا بخوێنرێت و گەورەترین سورەتی قورئانە، بەڵکو سەرجەم مەبەستی سورەتەکانی قورئانی پیرۆزی لە خۆ گرتووە، بۆیە بە باشمان زانیی بەکورتی تەفسیری بکەین و هەندێ لە فەزڵەکانی بخەینە ڕوو..

* ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾: بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان، ئەو خوایەی کە سەرچاوەی بەخشینی بێ کۆتاییەو ڕەحمەتی تەواو بوونی بۆ نیە..

* ﴿بِسْمِ اللَّهِ﴾ سەرەتای هەموو کارێکی خێرو گرنگە، ئەم وشە پاراوە پیرۆزە هەروەك دروشمی ئیسلامە، لە هەمان کاتدا زیکر و ویردی هەموو بوونەوەرانیشە بە زمانی حاڵیان..

جا لەبەر ئەوەی هەموو شتێك لە بونەوەردا بەزمانی حاڵ دەڵێت: ﴿بِسْمِ اللَّهِ﴾ ئەوا دەبێت ئێمەش هەموو کارێکمان "بەناوی خوا"وە بێ..

بەخشینمان "بەناوی خوا"وە بێت..

وەرگرتنمان "بەناوی خوا"وە بێت..

"بەناوی خوا "وە کارەکانمان بەجێ بهێنین.

بەڵێ، وتەی: ﴿بِسْمِ اللَّهِ﴾ گەنجینەیەکی گەورەی وایە کە "هەژاری"و "بێ دەستەڵاتی"ی مرۆڤ بە میهرەبانییەکی گەورەو دەسەڵاتێکی هێندە نەبڕاوە و بێ کۆتاییەوە پەیوەست دەکات کە جڵەوی بوونەوەرانی هەر لە گەردیلەکانەوە تا گەلە ئەستێرەکان لە دەستدایە، بە شێوەیەك کە ئەو "هەژاری"و "بێ دەستەڵاتی"یەی مرۆڤ دەگەیەنێتە پلەیەك

که دەبن بە تکاکار و، نزاو پاڕانەوەیان لە دەرگانەی خواوەندی بەدەسەلات و میهرەبان و شکۆمەندا گیرا دەکات[1]

* ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾: سوپاس و ستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیان.

* ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾: بەخشندەی میهرەبان.

* ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ﴾: ئەو زاتەیە کە کەرەم و ڕەحمەتی لە دنیادا هەموو شتێکی گرتووەتەوە.

* ﴿ٱلرَّحِيمِ﴾یش: سەرچاوەی ئەو ڕەحمەتە دەگەیەنێت کە تەواو بوونی بۆ نیە.

﴿مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ﴾: خاوەنی ڕۆژی قیامەت ڕۆژی سزاو پاداشت دانەوە، ئەو ڕۆژەی جگە لە خودا کەس خاوەن دەسەلات نیە.

* ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾: خودایە! هەر تۆ دەپەرستین لە تۆ زیاتر ملکەچی کەسی تر نابین، هەروەها جگە لە تۆ پەنا بۆ هیچ کەس و هیچ شتێکی تر نابەین. چونکە لە تۆ زیاتر کەسێکی تر نیە خاوەن دەسەلات و توانای ڕەها بێت لەم بوونەوەرەدا.

* ﴿ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ﴾: خودایە ڕێگای ڕاستمان پیشان بدە و هیدایەتمان بدە بۆ شوێنکەوتنی.

* ﴿صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ﴾: خودایە! ڕێگای ئەو کەسانەمان پیشان بدە کە چاکەت لەگەڵ کردوون لە پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاو چاکان، بە ڕاستی ئەوانە بۆ تۆ سوڵحان و کەمتەرخەمییان نەکردووە یارمەتیمان بدە بۆ شوێنکەوتنی ئەو ڕێگا ڕاستە.

* ﴿أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ﴾: ئەو کەسانەن هەقیان ناسیوە و شوێنی کەوتوون.

* ﴿غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾: نەماخەیتە سەر ڕێبازی ئەوانەی خەشم و قینیان لێگیراوە، هەروەها نەماخەیتە سەر ڕێبازی ئەوانەش کە سەرگەردان و گومڕان.

---

(١) وتەکان: مامۆستا نوورسی (بەرەحمەت بێت)،وەرگێڕانی فاروق ڕەسوڵ یەحیا.

* ﴿ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ﴾: ئەوانەن دەزانن حەق كامەیە بەڵام شوێن هەواو هەوەسی خۆیان دەكەون، ﴿ٱلضَّآلِّينَ﴾: ئەوانەن كە نەزان و نەفامن.

* عەدی كوڕی حاتم گێڕاویەتیەوە كە پێغەمبەری خوا فەرمویەتی : (الیهود مغضوب علیهم والنصاری ضلال)[1]. واتە: ﴿ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ﴾ واتە جولەكەكان، ﴿ٱلضَّآلِّينَ﴾ واتە گاورەكان.

لە دوای خوێندنی سورەتی فاتیحەوە سوونەتە بوترێت (آمین): واتە خوایە لێمان وەربگرە و قبوڵی بفەرموو.

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (إذا أَمَّنَ الإمام فأَمِّنُوا فإنه مَن وافق تأمِينُهُ تأمين الملائكة غُفر له ما تقدم من ذنبه)[2]. واتە: كاتێك ئیمام لە دوای ﴿وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾ وتی ئامین ئێوەش بەدوایا بیڵێن، چونكە ئامینی هەر كەسێك لەگەڵ ئامینی مەلائیكە پێكەوە بوترێن، خوای گەورە لە تاوانەكانی ڕابردووی دەبوورێ.

بێگومان سورەتی فاتیحە گەورەترین سورەتی قورئانە، لە شاری مەككەی پیرۆز هاتوەتە خوارەوە، بۆیە پێی دەوترێت سورەتی فاتیحە چونكە لە سەرەتای سورەتەكانی قورئانەوەیە، هەروەها (سبع المثاني)شی پێ دەوترێت چونكە بە ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ەكەوە حەوت ئایەتە، لەنوێژدا دووبارە دەكرێتەوە..هەروەها (أم الكتاب)یشی پێ دەوترێت، چونكە ئەم سورەتە سەرجەم مەبەستەكانی قورئانی لە خۆ گرتووە.

سورەتی فاتیحە نمونەیەكی نوورانی قورئانی پیرۆزە، بە هەمان جۆر "نوێژ"یش پێرستێكی نوورانییە كە هەموو پەرستشەكان لەخۆ دەگرێت و نەخشەیەكە ڕێ و شوێنی پەرستشەكانی سەرجەمی بەدیهاتووانی لەسەر دانراوە و ئاماژەی بۆ كراوە.

* عن أبي سعيد رافع بن المُعلّى ﷺ قال: كنت أصلي في المسجد، فدعاني رسول الله ﷺ فلم أجبه، فقلت: يا رسول الله، إني كنت أصلي، فقال: (ألم يقل الله: [ٱسۡتَجِيبُواْ لِلَّهِ

---

(١) أخرجه الترمذي:(٢٩٥٤)، وأحمد في المسند: (٣٧٨/٤)، وإبن حبان:(٢٢٩٧) وصححه الألباني

(٢)أخرجه البخاري: (٧٨٠)، ومسلم: (٤١٠).

وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُم لِمَا يُحْيِيكُمْ]. ثم قال لي: (لأعلمنك اعظم سورة في القرآن، قبل أن تَخرُج مِن المَسجد؟ فأخذ بِيَدي فلما أردنا أن نَخرُج قُلتُ: يا رسول الله إنك قلت لَأُعلّمنك أعظم السور في القرآن ؟ قال: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾، هي السَّبع المثاني، والقرآن العظيم الذي أوتِيتُهُ)[1]. واته: رافیع (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لە مزگەوت نوێژم دەخوێند، پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کردم، وەڵامم نەدایەوە، لەپاش سڵاو دانەوە وتم: ئەی پێغەمبەری خوا! نوێژم دەکرد بۆیە وەڵامم نەدایتەوە، فەرمووی: مەگەر خوای گەورە نا فەرموویت: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! بە دەم بانگەوازی خوا و پێغەمبەرەوە بچن کاتێك بانگتان دەکات بۆ بەرنامە و ڕێبازێك کە دەتان ژێنێتەوە و ژیان بەخشە. پاشان فەرمووی: ئایا گەورەترین سورەتت فێر بکەم لە قورئاندا پێش ئەوەی بچیتە دەرەوە لە مزگەوت؟ ئینجا دەستی گرتم کاتێك ویستمان پێکەوە بچینە دەرەوە لە مزگەوت، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا! تۆ فەرمووت گەورەترین سورەتت لە قورئاندا فێردەکەم، فەرمووی: ئەو سورەتە سورەتی ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ە کە ناویشی (السَّبعُ المَثاني)یە حەوت ئایەتی دووبارە بوەوە، هەروەها ناویشی (القرآن العظيم)ە قورئانی گەورەیە کە بە من بەخشراوە.

خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ سَبْعًا مِّنَ ٱلْمَثَانِى وَٱلْقُرْءَانَ ٱلْعَظِيمَ﴾ الحجر: ٨٧. واتە سوێند ەبەخوا بەڕاستی حەوت ئایەتی دووبارەکراوەمان پێ بەخشیت، هەروەها قورئانی گەورەش.

* ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (مَا أنزَل الله في التوراة وَلا في الإنجيل مِثل أُم القرآن وَ هي السَبعُ المَثاني..)[2]. واتە: نە لە

(١) أخرجه البخاري: (٤٢٠٤).

(٢) صحيح جامع الترمذي: ٢٩٧/٥، (٣١٢٥)، والبيهقي: (١٥١٤)، ومالك: ٨١/٣.

تەورات، نە لە ئینجیلدا ئایەت نەهاتووەتە خوارەوە فەزڵ و خێری بەقەدەر سوورەتی فاتیحە بێت کە (أُم القُرآن) و (السبع المثاني)ە.

عوبادەی کوڕی صامت فەرمووی پێغەمبەری خوا فەرمویەتی: (لاَ صَلاَةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ)[1]. واتە: ئەو کەسەی سورەتی فاتیحە نەخوێنێت نوێژی بۆ نیە.

* پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (من صلى صلاةً لم يقرأ فيها بأمِّ القرآن فهي خداجٌ فهي خداجٌ فهي خداجٌ: غير تمامٍ)[2]. واتە: هەر کەسێك سورەتی فاتیحە نەخوێنێت لە نوێژدا ئەوە نوێژەکەی تەواو نیە، تەواو نیە، تەواو نیە.

* قال رسول الله ﷺ: يقول الله تعالى: (قسمت الصلاة بيني وبين عبدي نصفين فنصفها لي ونصفها لعبدي ولعبدي ما سأل، يقوم العبد فيقول: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾، فيقول الله تبارك وتعالى: حمدني عبدي، فيقول: ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾. فيقول أثنى علي عبدي، فيقول: ﴿مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ﴾، فيقول مجدني عبدي، وهذا لي؛ وبيني وبين عبدي: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾. وآخر السورة لعبدي ولعبدي ما سأل، يقول: ﴿صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾[3]. واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خوای گەورە لە فەرموودەی قودسیدا دەفەرموێت: نوێژم دابەش کردووە لە نێوان خۆم و بەندەکەمدا ئەوەی بەندەکەم داوای دەکات پێی دەبەخشم.. کاتێك بەندە دەڵێت: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ سوپاس و ستایش بۆ خوای خاوەنی هەموو جیهانیان و بوونەوەر، هەست دەکات کە پەروەردگار شانازی پێوە دەکات سەرنجی مەلائیکەکانی بۆلای ڕادەکێشێت ودەفەرموێت: بەندەکەم سوپاس و ستایشی کردم.. کاتێك بەندە دەڵێت: ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەخشندە و میهرەبانە ئەو خوایەی کانگای ڕەحمەت و سۆزو بەزەییە، خوای گەورەش دەفەرموێت: بەندەکەم مەدح و سەنای کردم..کاتێك دەڵێت:

---

(١) أخرجه البخاري:(٧٥٦) و مسلم: (٣٤).

(٢) صحيح سنن أبو داود: ٢١٦/١، برقم(٨٢١).

(٣) أخرجه مسلم في الصلاة: (٣٩٥)، وأبو داود في الصلاة: (١٣٢).

﴿مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ﴾ خاوەن و سەرداری ڕۆژی قیامەت، دەفەرمویێت: سەرنج بدەن ئەوەتا بەندەکەم بەخاوەن دەسەڵات و شکۆمەندم دەزانێت.. کاتێك دەڵێت: ﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ﴾ خودایە عیبادەت هەربۆ تۆ دەکەم، داوای کۆمەکی هەر لە تۆ دەکەم، پشت و پەنام هەر تۆی، خوای گەورە دەفەرموێت: بەندەکەم ڕاست دەکات ئەوەتا بە کردار و بە گوفتار هەر من دەپەرستێت و هەر منیش بە پشتیوان دەزانێت.. تائێرە بەینی من و بەندەکەم بوو، بۆ بەندەکەم هەیە داوا بکات، کاتێك دەڵێ: ﴿صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾. دەفەرمویێت ئەمە بۆ بەندەکەمە، ئەوەی داوای کرد پێی دەبەخشم.

سورەتی فاتیحە ئەگەر بە ئیمانەوە بخوێنرێت بە سەر هەر نەخۆشێکی ئیمانداردا بەویستی خوا شیفای بۆ دێت چونکە سورەتێکی شیفا بەخشە..

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (الفاتحة الكتاب شِفاء من كل سَم)[1]. واتە: خوێندنی سورەتی فاتیحە شیفایە بۆ هەموو ژەهرێك.

* پێغەمبەری خوا ﷺ چەند هاوەڵێکی نارد بۆ کارێك دایان بە لای قەومێك دا میوانداریيان نەکردن، خوای گەورە دووپشکێکی زاڵ کرد بەسەر گەورەکەیاندا و پێوەی دا، توشی ئازارێکی زۆر سەخت بوو، وتیان بنێرن بۆ لای ئەو کۆمەڵە بزانن یەکێکی خوێندەواریان تێدا نیە شتێکی پێدا بخوێنێ بەڵکو چاك ببێتەوە و شیفای بۆ بێت - مەبەستیان هاوەڵەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو- هاتن بۆ لای هاوەڵان و هەواڵەکەیان دانێ، ئەوانیش وتیان: بەڵێ شتێکی بەسەرا دەخوێنین بە مەرجێك مەڕێکمان بدەنێ بۆ خۆمان لە جیاتیدا، یەکێ لە هاوەڵان چوو سورەتی فاتیحەی بەسەردا خوێند، کە تا ئەو کاتەش ئازارێکی زۆر زۆری هەبوو، هەر وەك وشترێکی بەستراوە بەرەڵای بکەی ئاوا ڕزگاری بوو ئازاری نەماو چاك بوویەوە، مەڕەکەیان دانێ، هاوەڵان لە نێوان خۆیاندا وتیان بلێی حەرام نەبێت، گۆشتەکەی ناخۆین تا پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ نەکەین، کاتێك

---

(١) أخرجه الدارمي: (٢/٤٤٥)، وديلمي: (٤٣٨٥).

گەیشتنەوە مەدینە هەواڵەکەیان دا بە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (بچن سەهمێك لەو گۆشتە بۆ منیش بهێنن)[1]!. ئەوەش بۆ ئەوە بوو هاوەڵانی دڵنیا بکات لەوەی ئەو گۆشتە حەڵاڵە ئەگینا ئەو پێویستی بەو گۆشتە نەبوو.

# پلەو پایەی نوێژ

خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتۡ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ كِتَٰبٗا مَّوۡقُوتٗا﴾ النساء: ١٠٣. واتە: بێگومان نوێژ فەرمانێکی پێویست و کات دیاریکراوە.

نوێژ یەکەم عیبادەتە کە فەرزکرا لە سەر موسوڵمانان، نزیکەی سێ ساڵ پێش کۆچکردنیان بۆ مەدینە، ئەو فەرزەیە کە لە ئاسماندا لە شەوی میعراجدا ڕاستەوخۆ لە نێوان پەروەردگار و پێغەمبەردا ﷺ ڕوویدا، لەو ئاهەنگە پڕ شکۆیەدا بوو کە یەکەم جارە مرۆڤ بگاتە ئەو شوێنە بەرزە، لە شەو و ڕۆژێکدا پێنج جار نوێژ فەرزکرا لەسەرخۆی و ئوممەتەکەی، نوێژ یەکێکە لە پایە گرنگەکانی ئیمان لە دوای شایەتومان دێت، کۆڵەکەی دینە، کۆڵەکە چۆنە بۆ دەوار نوێژیش ئاوەهایە بۆ دین. ئایا دەوار بەبێ کۆڵەکە ڕادەوەستێ؟!..

نوێژ گەورەترین فەرزی ئیسلامە، گەورەترین عیبادەتی جەستەیە، خوای گەورە لە قورئاندا لە دوای باسی ئیمان زیاد لە هەموو پەرستشەکانی تر گرنکی پێداوە، هەموو پایەکانی ئیسلام لە نوێژدا کۆدەبنەوە، هەروەها لە سوننەتەکانی پێغەمبەرشیدا بە هەمان شێوە گرنگی پێدراوە..

نوێژ کلیلی بەهەشتە و، باشترین کردەوەیە، ئەو ڕێزەی بۆ نوێژ دیاریکراوە نەدراوەتە هیچ پایەیەکی تری دین، بەندایەتی بەبێ نوێژ هیچ سوودێکی بۆ قیامەت نیە، یەکەم کردەوەیە لە قیامەتدا موحاسەبەو لێ پرسینەوەی لەسەر دەکرێت، نوێژ پەرستشێکی زۆر کۆنە گەلانی پێشوو هەموویان نوێژیان کردووە، ئیبراهیم عليه السلام لە دوعاکانیدا داوای کردووە

---

(١) أخرجه البخاري: (٥٠٠٧) ومسلم في السلام: (٦٥) وأبو داود في الطب: (١٩).

لە خوای گەورە خۆی و نەوەکانی لەو کەسانە بن کە نوێژ بەچاکی ئەنجام دەدەن: ﴿ رَبِّ ٱجۡعَلۡنِي مُقِيمَ ٱلصَّلَوٰةِ وَمِن ذُرِّيَّتِيۚ رَبَّنَا وَتَقَبَّلۡ دُعَآءِ ﴾ إبراهيم: ٤٠.

هەروەها خوای گەورە مەدحی ئیسماعیلی کوڕیشی پێدەکات:﴿ وَكَانَ يَأۡمُرُ أَهۡلَهُۥ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ وَكَانَ عِندَ رَبِّهِۦ مَرۡضِيّٗا ﴾مريم:٥٥.واتە: هەمیشەو بەردەوام فەرمانی دەدا بە کەس و کار و خێزانی کە نوێژ بکەن و زەکات بدەن، ئەو لە لای پەروەردگاری شایستەی ڕێز و ڕەزامەندی بوو..

لە پەندو ئامۆژگاریەکانی لوقماندا بۆ کوڕەکەی هاتووە: ﴿ يَٰبُنَيَّ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ وَأۡمُرۡ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَٱنۡهَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ ﴾ لقمان: ١٧. واتە: کوڕی شیرینم نوێژەکانت بەچاکی ئەنجام بدە، فەرمان بە چاکە بکە، ڕێگری و قەدەغەی خراپەش بکە.. هەر لەسەرەتای وەحیدا بەموسای ﷺ فەرمووە: نوێژەکانت بەچاکی ئەنجام بدە، تا هەمیشە منت لەیاد بێت ﴿ إِنَّنِيٓ أَنَا ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدۡنِي وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ ﴾ طه: ١٤.

عیساش ﷺ هەر منالێکی ساوابوو هاتەگفت و فەرمووی: ﴿ وَأَوۡصَٰنِي بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ مَا دُمۡتُ حَيّٗا ﴾ مريم: ٣١. واتە: عیسا منالێکی ساوا بوو هاتە گفت و بە دەنگە ناسکەکەی فەرمووی: پەروەردگارم ئامۆژگاری کردووم هەتا لە ژیاندا بم نوێژەکانم ئەنجام بدەم و لە زەکات دانیش دریغی نەکەم.

هەروەها بە پێغەمبەری ئازیز و خۆشەویستمان ﷺ دەفەرموێت: ﴿ ٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾العنكبوت: ٤٥. واتە: ئەی پێغەمبەر! ئەوەی بۆت ڕەوانە دەکرێت لە قورئان بیخوێنەرەوەو، نوێژیش بە چاکی ئەنجام بدە.

پێویستە نوێژ پارێزگاری لێ بکرێت و بەچاکیش ئەنجام بدرێت، جا چ لەماڵەوە بێت یان لە سەفەردا بێت، یان لەکاتی ئاشتی و ئاسایشدا بێت یان لەکاتی جەنگ و ناخۆشی و ترسدا بێ: ﴿ حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلۡوُسۡطَىٰ وَقُومُواْ لِلَّهِ قَٰنِتِينَ (٢٣٨) فَإِنۡ خِفۡتُمۡ فَرِجَالًا أَوۡ رُكۡبَانٗاۖ فَإِذَآ أَمِنتُمۡ فَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ كَمَا عَلَّمَكُم مَّا لَمۡ تَكُونُواْ تَعۡلَمُونَ ﴾

البقرة: ٢٣٨ - ٢٣٩. لەکاتی ترس و جەنگدا نوێژ ئەنجام بدەن بە پیادە بێ یان بە سواری، چۆن دەتوانن ئەنجامی بدەن بەبێ ڕکوع و سەجدە، بەڵکو بە ئیشارەت کردن، مەرج نیە ڕووش بکەنە قیبلە، ئەوەندە نوێژ گرنگی پێدراوە!.

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (رَأس الأمرِ ألإسلامُ وَ عَمُدُهُ الصَّلاة..)[1]. واتە: چڵە پۆپەی ئەم دینداریيە، گەردن کەچی و گوێ رایەڵییە بۆ خوا و ستونی ڕاگرتنیشی نوێژە.

* هەروەها دەفەرموێت: (مَن آمَن بالله و رسوله وأقامَ الصلاة وَصام رمضان فانّ حقاً على الله أن يدخلة الجنّة، هاجر في سبيل الله أو جلس في أرضه التي ولد فيها..)[2]. ئەوەی باوەڕی بە خوا و پێغەمبەر هەبێت نوێژەکانی بە چاکی ئەنجام بدات و ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بگرێت خوای گەورە دەیخاتە بەهەشتەوە، کۆچی کردبێت لە ڕێی خوا، یان لە جێگەی لە دایك بوونی خۆی مابێتەوە.

* پێغەمبەری خوا ﷺ لە دواسات و نەخۆشی ماڵئاوایی یەکجاریدا هەر هۆشی بەلای نوێژەکانیەوە بوو!..

* عویەیدولای کوڕی عەبدولا (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: چووم بۆ خزمەت دایکی ئیمانداران عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) پێم وت: ئایا باسێکی نەخۆشیەکەی پێغەمبەرم ﷺ بۆ ناکەیت؟. فەرمووی: بەڵێ بۆت باس دەکەم: کاتێك نەخۆشیەکەی تینی بۆ هێناو تایەکی زۆری لێهات پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (ئاوم بۆ بێنن لە دەفرێکدا). ئێمەش بۆمان ئامادەکرد، دەستنوێژی گرت پاشان هەستایە سەرپێ بڕوات بەرەو مزگەوت بۆ پێش نوێژی خەڵکەکە، لە هۆش خۆی چوو پاشان هۆشی هاتەوە و فەرمووی: (أصلّى الناس ؟) ئایا خەڵکەکە نوێژیان کرد؟ وتمان نەخێر چاوەڕێی تۆن ئەی پێغەمبەری خوا!. فەرمووی: (ئاوم بۆ بهێنن لە دەفرێکدا). ئێمەش بۆمان ئامادەکرد، دەست نوێژی گرتەوە و هەستایە سەرپێ

(١)أخرجه الترمذي: (٢٤٤٩)، صحيح جامع: ٥/١١، برقم (٢٦١٦).

(٢) صحيح البخاري: (٢٧٩٠)، (٧٤٢٣).

بڕوات، لە هۆش خۆی چووەوە، پاشان هاتەوە سەرخۆی، فەرمووی: (أصلّى النّاس؟) ئایا خەڵکەکە نوێژیان کرد؟ وتمان: نەخێر چاوەڕێی تۆن ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ فەرمووی: (ئاوەکەم بۆ بهێنن لە لەنگانەکەدا). ئێمەش بۆمان ئامادەکرد، دەستنوێژی گرت و، هەستایە سەرپێ بڕوات لە هۆش خۆی چوو، پاشان هاتەوە سەرخۆی، فەرمووی: (أصلّى الناس؟!) ئایا خەڵکی نوێژیان کرد؟ وتمان: نەخێر چاوەڕێی تۆن ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ.. عایشە فەرمووی: موسڵمانان کۆبونەوە و چاوەڕێی پێغەمبەری خوایان دەکرد لە مزگەوتدا بۆ نوێژی عیشا، دواجار پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بەدوای ئەبوبەکردا، بێت پێش نوێژی بۆ خەڵکەکە بکات، نێردراوەکەی پێغەمبەری خوا هات و بە ئەبوبەکری (ڕەزای خوای لێ بێ) وت: پێغەمبەری خوا فەرمانی پێکردووی پێش نوێژی بۆ خەڵك بکەیت، ئەبوبەکر ڕەزای خوای لێ بێ پیاوێکی دڵ نەرم بوو فەرمووی: ئەی عومەر تۆ پێش نوێژییان بۆ بکە، عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: تۆ شایەن تری بەو شوێنە نەك من، عایشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەوچەند ڕۆژە ئەبوبەکر پێش نوێژی بۆ دەکردن. پێغەمبەری خوا ترسێك کەوتە دڵیەوە، دوو پیاو چوونە ژێر باڵی کە یەکێکیان عەبباسی مامی بوو (ڕەزای خوای لێ بێ)، لە ماڵ دەرچوو بەرەو مزگەوت، سەیری کرد ئەبوبەکر پێش نوێژی دەکات. کاتێك ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێ بێ) پێغەمبەری خوای بینی ویستی بڕواتە دواوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ئیشارەتی بۆ کرد لە جێی خۆی بمێنێ. فەرمووی: لە تەنیشتیەوە دام نیشێنن، ئەوانیش دایان نیشاند لەتەنیشت ئەبوبەکرەوە، ئیتر ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێ بێ) بەپێوە ئیقتیدای کرد بە پێغەمبەرەوە ﷺ و خەڵکەکەش بە ئەبوبەکرەوە، پێغەمبەریش بەدانیشتنەوە نوێژەکەی کرد[1].

* ئیمامی علی (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: دوا وتە و ئامۆژگاری پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ هاوەڵە بەڕێزەکانی ئەوە بووە دەیفەرموو: (الصَّلاَةَ، الصَّلاَةَ، اتَّقُوا اللهَ فِيما مَلَكَتْ أَيْمانُكم)[2]. واتە: نوێژەکانتان، نوێژەکانتان، لەگەڵ بەندەکانی ژێر دەستتان لە خوا بترسن و زوڵم و ستەمیان لێ مەکەن.

---

(١) أخرجه البخاري (٦٨٧) ومسلم (٤١٨).

(٢) صحيح سنن أبوداود: (٤٢٩٥)، وإبن ماجه، وانظر الإرواء: (٢١٧٨).

سەرنج بدەن چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ لە دواساتەکانی ژیانیدا بەتەنگ نوێژەوە بووە و گرنگی داوە بە نوێژی جەماعەت لە مزگەوتدا، چوار جار لەسەر یەك دەستنوێژ دەگرێ و هەوڵ دەدات هەستێتە سەرپێ و برِوات بۆ پێش نوێژی موسڵمانان لە مزگەوتدا، بەڵام لە هۆش خۆی دەچوو پاشان هۆشی دەهاتەوە سەر خۆی، دەیفەرموو: ئایا خەڵکەکە نوێژیان کرد؟ تاچوار جاریەو شێوەیە. کاتێك ترسی لێ نیشت لە ژێر باڵی دووکەس لە هاوەڵانیدا چوو بۆ مزگەوت و پێش نوێژی بۆ کردن. چاوی کەوت بەهاوەڵەکانی رِەزاو رەحمەتی خوایان لێ بێت!.

ئەوەی پێغەمبەری خوا کردی لەو ساتە وەختەدا بەو نەخۆشیە بەڵگەیە لەسەر گەورەیی و گرنگی نوێژی جەماعەت و، پێگە و شوێنی نوێژ.

ئەوە پێغەمبەری خوایە ﷺ خوای گەورە لە گوناهی رِابردوو و داهاتوشی خۆشبووە ئاوا بەتەنگ نوێژەوە بووە و گرنگی پێداوە، ئەی ئێوە ئەی لەش ساغەکان؟ ئەی ئێوە ئەی لاو و گەنجەکان؟ ئەی ئەوانەی خاوەنی جەستەی ساغ و بەهێزن؟ چۆن رِازی دەبن لە خۆتان کەدوا دەکەون لە نوێژی جومعەو جەماعەت؟!.. ئەی کاتێك نەخۆش بوون چی دەکەن؟.

ئەی موسوڵمانە خۆشەویستەکان، ئەی خواویستەکان: (الصَّلاة، الصَّلاة). دوا وتە و ئامۆژگاری پێغەمبەری خوایە ﷺ بۆ هاوەڵەکانی، یەکەم شتێ خوای گەورە موحاسەبەتان دەکات لەسەری نوێژەکانتانە لە قیامەتدا.. دەی ئێوەش لە خوابترسن نوێژەکانتان بەرِکوع و سەجدە و خشوعی تەواوەوە ئەنجام بدەن، موحاسەبەی خۆتان بکەن پێش ئەوەی خوای گەورە موحاسەبەتان بکات لە قیامەتدا.

* نوێژ نوور و رِووناکییە، وەك لەم فەرمودەیەدا ئاماژەی بۆ کراوە: (الطُّهُورُ شَطْرُ الإِيمَانِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ تَمْلأُ الْمِيزَانَ. وَسُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ تَمْلآنِ- أَوْ تَمْلأُ- مَا بَيْنَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَالصَّلاَةُ نُورٌ..)[1]. بێگومان ئەوەی خوا نوری پێ نەبەخشێت، هەرگیز نوری دەست ناکەوێت، وەك خوای گەورە لەم ئایەتە پیرۆزەدا دەفەرموێت:

---

(١) رواه مسلم: (٥٥٦)، (٢٢٩٩)، وأحمد: (٥/٣٤٢).

﴿ أَوْ كَظُلُمَٰتٍ فِي بَحْرٍ لُّجِّيٍّ يَغْشَىٰهُ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِۦ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِۦ سَحَابٌ ظُلُمَٰتُۢ بَعْضُهَا فَوْقَ بَعْضٍ إِذَآ أَخْرَجَ يَدَهُۥ لَمْ يَكَدْ يَرَىٰهَا ۗ وَمَن لَّمْ يَجْعَلِ ٱللَّهُ لَهُۥ نُورًا فَمَا لَهُۥ مِن نُّورٍ ﴾ النور: ٤٠

# نوێژ تەرك كردن

بێگومان تەرككردنی نوێژ یەكێكە لە تاوانە گەورەكان و ، هۆی چوونە دۆزەخە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فِي جَنَّٰتٍ يَتَسَآءَلُونَ ﴿٤٠﴾ عَنِ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٤١﴾ مَا سَلَكَكُمْ فِي سَقَرَ ﴿٤٢﴾ قَالُوا۟ لَمْ نَكُ مِنَ ٱلْمُصَلِّينَ ﴿٤٣﴾ وَلَمْ نَكُ نُطْعِمُ ٱلْمِسْكِينَ ﴾ المدثر: ٤٠ - ٤٤. واتە: ئەوكەسانەی سەر فراز و شادمانن لە بەهەشتدا بە تاوانبارانی دۆزەخ دەڵێن: ئەوە چی بوو ئێوەی ڕاپێچی دۆزەخ كرد ؟! لە وەڵامدا دەڵێن: لە نوێژخوێنان نەبووین، خۆراكمان بەهەژاران نەدەبەخشی.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ فَخَلَفَ مِنۢ بَعْدِهِمْ خَلْفٌ أَضَاعُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّبَعُوا۟ ٱلشَّهَوَٰتِ فَسَوْفَ يَلْقَوْنَ غَيًّا ﴾ مريم: ٥٩. واتە: ئینجا لە پاش ئەوان كەسانێك لە نەوەكانیان بوونە جێنشینیان نوێژیان دەفەوتاند و شوێن هەوا و ئارەزوو كەوتن، جا ئەوانە لە داهاتوودا تووشی (سزای) گومڕاییان دەبن.

نوێژنەكردن دەبێتە هۆی پشتكردنە دینی خواو، سزای سەختی ناو گۆڕ: ﴿ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ أَعْمَىٰ ﴾ طه: ١٢٤.

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (أمرت أن أقاتل الناس حتى يشهدوا أن لا إله إلا الله وأن محمدا رسول الله ويقيموا الصلاة ويؤتوا الزكاة فإذا فعلوا ذلك عصموا مني دماءهم وأموالهم إلا بحق الإسلام وحسابهم على الله)[1]. واتە: فەرمانم پێكراوە: كە بجەنگم لەگەڵ ئەو خەڵكەدا هەتا شایەتمان دێنن و، بەڕێك و پێكی نوێژ بكەن و زەكات بدەن، ئیتر ئەوەی ئاوا بكات ئەوە سەر و ماڵی خۆی لەمن قەدەغەدەكات و خوێن و ناموس و ماڵی

(١) متفق عليه.

له من حەرام دەبێ، مەگەر لەسەر حەقی شەرعی، ئیتر حساب و لێپرسینەوەی نیازی دڵی لەو دنیا لەسەر خوایە. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّواْ سَبِيلَهُمْ﴾التوبة: ٥. واتە: ئەگەر تەوبەیان کرد و، نوێژیان کرد و، زەکاتیاندا وازیان لێ بهێنن..

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (بَيْنَ الرَجُلِ وَبَيْنَ الشِرْكِ وَالْكُفْرِ تَرْكُ الصّلاةِ)[1]. واتە: جیاوازیی نێوان پیاوی موسڵمان و هاوەڵ و شەریك بۆ خوا دانەر نوێژ نەکردنە.

* ئوم ئەیمەن (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا پێی فەرمووم: (لا تترك الصلاة متعمدا فإنه من ترك الصلاة متعمدا فقد برئت منه ذمة الله ورسولهِ).[2] واتە: بە ئەنقەست واز لە نوێژ مەهێنە، ئەوەی نوێژێك بەبێ هۆ نەکات ئەوە بەری دەبێت لە وەعد و بەڵێنی خوا.

* هەروەها فەرموویەتی: (مَن فاتَتْهُ الصّلاةِ فَكأ نّمَا وُتِرَ أَهْلُهُ وَ مَالُهُ)[3]. واتە: هەرکەسێك نوێژێك بفەوتێنێت بێ بەهانەیەکی شەرعی وەك ئەوە وایە خانەوادە و ماڵ و سامانەکەی لە دەست بدات. ئەوە بۆ یەك نوێژ ئەی ئەگەر کەسێك نوێژ نەکات ئەبێ حاڵی چی بێ؟!.

بەڵێ وەك ئەوە وایە ماڵ و منداڵ و سامانەکەی لەدەست بدات، جا برای موسڵمان چۆنە بەلاتەوە ئەگەر کوڕیەکەت یان جگەرگۆشەکەت لەدەست بدەیت کەلات خۆشەویست و سەنگینە، یان خێزانە خۆشەویستەکەت لەدەست بدەیت کەمایەی حەوانەوەی ژیانتە، یا ئەو ماڵ و سامانەی کە ئەو هەموو هەوڵ تەقەلایەت بۆ داوە!. بێگومان ئەوەی یەك نوێژ بفەوتێنێت ئەی ئەگەر هەموو نوێژەکان بفەوتێنێت دەبێ چۆن بێ!.

---

(١) أخرجه مسلم: (٨٢).

(٢) أخرجه أحمد، وقال الألباني صحيح لغيره في صحيح الترغيب والترهيب: ٥٧٣/١.

(٣)رواه إبن حبان، و صححه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب: ٧٧٥.

ئەو کەسانەی نوێژ بەجەماعەت نەکەن شەیتان زاڵ دەبێ بەسەریاندا، ئەی ئەگەر تەرکی بکەن دەبێ حاڵیان چۆن بێ؟!. پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (مَامِن ثَلاَثَة في الْقَريَة، ولاَبَدْوٍ، وَلاتُقَام فيهم الصَّلاةَ إلا قَدْ استحْوَذَ عَلَيهمُ الشَيْطَان، فَعَلَيكَ بالجَماعَة فَإنَّما يَأكُلُ الذئبُ القَاصِيَة)[1]. واتە: ئەگەر سێ کەس پێکەوە بوون جاگوند نشین بوون یان کۆچەری بەکۆمەڵ نوێژیان نەکرد، ئەوە شەیتان زاڵ بووە بەسەریاندا، کەواتە ئەی موسڵمان بەجەماعەت نوێژەکانت بکە لەگەڵ جەماعەتی موسڵمانان بە، چونکە گورك ئەو مەڕە دەخوات کە تەنهایە.

زانایان و ئیمامە موجتەهیدەکان (ڕەحمەتی خوایان لێ بێ) ڕای جیاوازیان هەیە لە حوکمی نوێژ نەکەردا بەقەستی بێ یان لەبەر تەمەڵی:

پێشەوا شافیعی و مالیك (ڕەحمەتی خوایان لێ بێ) دەڵێن: پێی کافر نابێ، بەلاّم داوای لێ دەکرێت نوێژ بکات ئەگەر نەیکرد دەکوژرێت لەسەر نەکردنی، نەك لەسەر ئەوەی کە کافر بووە.

هەندێکی تر لە زانایان ڕایان وایە هەر کەسێك لەبەر تەمەڵی نوێژ نەکات کافر دەبێت، لەوانە پێشەوا علی کوڕی ئەبوتالیب و ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (ڕەزای خوایان لەسەر بێ).

هەندێکی تریان دەڵێن: دەبێ بکرێتە زیندان تا تەوبە دەکات و دەگەڕێتەوە یان دەمرێت وەك پێشەوا ئەبو حەنیفەی نعمان.

ئیبن قەیم (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: بە بەڵگەی قورئان و سوننەت و یەك دەنگی هاوەڵان ئەو کەسەی نوێژ نەکات پێی کافردەبێ، ئیسحاقی کوڕی راهویەش (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) نەقڵی ئەوەی کردووە [2].

ئەمە جیاوازی و ڕای زانایانە لەسەر ئەو کەسەی کە باوەڕی پێی هەیە بەلاّم لەبەر تەمەڵی نایکات یان خۆی بەتاوانبار دەزانێ.. بەلاّم بۆ ئەوکەسانەی گاڵتە بە نوێژ دەکەن و باوەڕیان پێی نیە و بەفەرزی نازانن ئەوانە بەیەك دەنگی زانایان پێی کافر دەبن، ئەگەر

---

(١) أخرجه أحمد، صحيح سنن أبن داود: (٥١)، وحسنه الألباني في المشكاة: (١٠٦٧).

(٢) كتاب الصلاة لإبن قيم.

ژنەکەی موسڵمان بوو لێی دەسەندرێتەوە، چونکە بەشەرع خێزانی ئەو نیە، هەر کارێکی جووت بوونی لەگەڵدا ئەنجام بدات وەك زینای کردبێ وایە، ئەو منداڵەش کە دەبێت منالی زینایە، ئەگەر مردیش نوێژی لەسەر ناکرێ و لە گۆڕستانی موسڵماناندا نانێژرێت، لە میراتی موسالّمانیش میراتی ناکەوێت، با باوکی خۆشی بێت.

* عەبدولای کوڕی شقیق فەرمووی: كان أصحاب محمد ﷺ لا يرون شيئا من الأعمال تركه كفر غير الصلاة[1]. واتە: هاوەڵانی پێغەمبەرﷺتەرك کردن و ئەنجام نەدانی هیچ کردەوەیەکیان بە کوفر و بێ باوەڕی دانەناوە جگە لە نوێژ.

* عبدللە ی کوڕی عەمر رەزای خوای لێ بێ گێڕاویەتەوە کە پێغەمبەری خوا ڕۆژێك باسی نوێژی کردوو فەرمووی: (من حافظ عليها كانت له نورا وبرهانا ونجاة يوم القيامة، ومن لم يحافظ عليها لم يكن له برهان ولا نور ولا نجاة، وكان يوم القيامة مع قارون وهامان وفرعون وأبي بن خلف)[2]. واتە: هەرکەسێك پارێزگاری لە نوێژەکانی بکات و ئەنجامیان بدات لەکاتی خۆیاندا دەبنە ڕووناکی و بەڵگە بۆی و ڕزگار بوونی لە ڕۆژی قیامەتدا، هەرکەسێکیش وای نەکرد ئەوا نە ڕووناکین و نەبەڵگەن و نە دەبنە هۆی ڕزگاربوونی، لەگەڵ قارون و فیرعەون و هامان و ئوبەی کوڕی خەڵەف حەشر دەکرێت و پێکەوە دەبن لە دۆزەخدا.

زانایان لە ڕاڤەی ئەم فەرموودەیەدا دەڵێن: هەرکەسێ ماڵ و سامان سەرقاڵی بکات و تەرکی نوێژەکانی بکات ئەوە لەگەڵ قاروونە، هەر کەسێکیش کورسی و دەسەڵاتەکەی سەرقاڵی بکات و نوێژەکانی بفەوتێنێ ئەوە لەگەڵ فیرعەونە، هەرکەسێکیش کاروباری وەزارەت و سەرۆکایەتی سەرقاڵی بکات ئەوە لەگەڵ هامانە، ئەوەشی بەبازرگانیەوە خەریك بێ و تەرکی نوێژەکانی بکات ئەوە لەگەڵ ئوبەی کوڕی خەڵەفدایە کە یەکێك بووە لە کافرەکانی سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ.

---

(١) صحيح جامع الترمذي: ١٤/٥، ٢٦٢٢، والحاكم على شرط الشيخين.

(٢) رواه أحمد والطبراني وابن حبان: ١٤٨٩، وقال الألباني صحيح في المشكاة: ٥٧٨/١.

# نویژ پاك و خاوێنییە :

پێویستە لەسەر موسڵمان ڕوخساری جوان بێ، خۆی لە بیر نەکات، جل و بەرگی خاوێن بێت و سەر مەشق بێت با خەڵك چاو لەو بکەن، چونکە پێغەمبەری ئازیزو خۆشەویستمان ﷺ پاك و خاوێن بووە و فەرمانیشی کردووە بە هاوەڵانی پاك و خاوێن بن بە تایبەتی لەکاتی چوون بۆ مزگەوت و نوێژی جەماعەت، یان کاتێك وەفدی قەومەکان دەهاتن بۆ لای دەیفەرموو خۆتان بڕازێننەوە و بۆنی خۆش لە خۆتان بدەن..

خوای گەورە لە قورئاندا چەندەها جار باسی پاك و خاوێنی کردووە لەبەر گرنگیەکەی، هەروەها فەرزی کردووە لە سەر موسڵمانان دەستنوێژ بگرن بۆ نوێژەکانیان، لە چەندەها کات و حاڵەتیشدا دەبێت خۆیان بشۆن: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى ٱلْمَرَافِقِ وَٱمْسَحُواْ بِرُءُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى ٱلْكَعْبَيْنِ وَإِن كُنتُمْ جُنُبًا فَٱطَّهَّرُواْ﴾المائدة: ٦. واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە کاتێکك هەستان بۆ نوێژکردن، ئەوە ڕوخسارتان بشۆن، هەروەها دەستەکانتان تا ئانیشکەکانتان، پاشان دەستی تەڕ بهێنن بەسەرتاندا، پێکانتان بشۆن تا هەردوو قولە پێتان، ئەگەر لەش گران بوون ئەوە خۆتان بشۆن و خۆتان خاوێن بکەنەوە.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿لَّمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى ٱلتَّقْوَىٰ مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِ ۚ فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُواْ ۚ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُطَّهِّرِينَ﴾التوبة: ١٠٨. واتە: مزگەوتێك کە یەکەمجار بناغەکەی بۆ تەقواو خواناسی دامەزرابێت شایانترە نوێژی تێدا بکەیت، چونکە ئەو موسڵمانانەی خوا پەرستی تیا دەکەن و بە نوێژ کردن ئاوەدانی دەکەنەوە، دەیانەوێت خۆیان لە هەموو کردەوەیەکی خراپ دوور بخەنەوە و خۆیان پاك ڕابگرن، خوداش ئەو کەسانەی خۆش دەوێت لە گوناه و خراپە خۆیان پاك ڕادەگرن، جا چ پاك و خاوێنی جەستە بێت یان پاك و خاوێنی ڕۆح و دڵ و دەروون.

* پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کردووە بە موسڵمانان کە خۆیان بڕازێنەوە لە مزگەوتەکاندا، بۆنی خۆش لە خۆیان بدەن، جل و بەرگی پاك و خاوێن لەبەرکەن، سیواك

بکەن و، دووریکەونەوە لە بۆنی ناخۆش و، جل و بەرگی پیس و چلکن لەبەرنەکەن.

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (الطُّهُورُ شَطْرُ الإِيمَانِ..)[1]. واتە: پاك و خاوێنی نیوەی ئیمانە.. ئەمەش پاك و خاوێنی جل و بەرگ و، دڵ و دەروونیش دەگرێتەوە..

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (طَهِّروا هذهِ الاجسَاد طَهَّرَكمُ اللهُ)[2].واتە: جەستەتان پاك و خاوێن ڕابگرن با خوای گەورەش پاکتان بکاتەوە.

* هەروەها دەفەرموێت: (إذا اسْتيقَظَ أَحَدُكُم مِن نَومِهِ فلا يُدخِلُ يَدَهُ في الإناءِ حَتّى يَغسِلَها ثلاثاً، فَإنَّ احدَكُم لايَدْري أَيْنَ باتَت يَدُهُ)[3]. واتە: ئەگەر یەکێتان هەستا لە خەو بادەستی نەخاتە ناو ئەو دەفرەوە کە ئاوی تێدایە و بەکاری دەهێنێ، تا سێ جار دەستی نەشوات، چونکە نازانێ دەستی بەرکوێ کەوتووە کاتێك لە خەودا بووە.

پاك وخاوێنی ئاسەوارێکی گەورەی هەیە لەسەر جەستە بە تایبەتی (سنن الفطرة) ڕەوشتە پاکەکان کە ڕەوشتی پێغەمبەرانن،، بەشێکن لە هەویە و پێناسەی ماددی و مەعنەوی موسڵمان و سیمای جوان دەکەن و بە هەیبەت دەبێت..

* عائشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا فەرمویەتی: (عشر من الفطرة: قص الشارب، وإعفاء اللحية، والسواك، واستنشاق الماء، وقص الأظفار، وغسل البراجم، ونتف الإبط، وحلق العانة، وانتقاص الماء)[4]. قال مصعب: ونسيت العاشرة. إلا أن تكون المضمضة. واتە: سوننەتی فیترەت بریتین لە دە ڕەوشتی پاکی پێغەمەران: سمێڵ کورت کردنەوە، ڕیش هێشتنەوە و بەردانەوەی، سیواك کردن، ئاو لە لوت وەردان، نینۆك کردن، شتنی لۆچی پەنجەکان، دەرهێنانی مووی بن باڵ، تاشینی مووی شەرمگا، تارەت گرتن. موصعەب (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: دەیەمم لە بیرنەماوە ئەگەر ئاو لە دەم ڕادان نەبێ.

---

(١) رواه مسلم: (٥٥٦)، (٢٢٩٩)، وأحمد: (٣٤٢/٥).

(٢) رواه الطبراني و قال الألباني حسن لغيره في صحيح الترغيب و الترهيب: (٥٩٩).

(٣) أخرجه البخاري: (١٥٤)، ومسلم: (٦٤٤).

(٤) أخرجه البخاري: (٥٨٩٣)، ومسلم في الطهارة: (٥٦).

هەروەها پێشەوا نەوەوی (بەرەحمەت بێ) لە شەرحی (صحیح مسلم)دا لەبارەی ئەم فەرموودەوە دەڵێت: دەگونجێ دەیەم خەتەنەکردن بێ.

پێشەوا ئیبن حەجەر لە ڕاڤەی ئەم فەرموودەیەدا دەفەرموێت: پەیڕەوکردنی ئەم سوننەتانە چەندەها حیکمەت و بەرژەوەندی دین و دنیای تێدایە وەك هەست کردن بە شوێن کەوتنی ئاینیی ئیسلام و ڕەوشتی پێغەمبەران، سیما و ڕووخساری جوان، پاك وخاوێنی بە تەواوی مەعنا، کە ئەحتیاتن بۆ دەستنوێژ و غوسڵ کردن یان خۆشتن، کردەوەی چاکەن لە بەرامبەر پاراستنی مافی خەڵکانی دەوروبەر و ئازار نەدانیان بەبۆنی پیس، خۆ جیاکردنەوەیە لە کافر و بت پەرستان و گاورو جولەکە و ئاگر پەرستان ودژایەتی دروشمەکانیانە، جێبەجێ کردنی فەرمانی خوای گەورەیە کە دەفەرموێت:﴿ وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ ﴾التغابن: ٣. واتە: خوای گەورە بە جوانترین شکڵ و شێوە سیما و ڕووخساری ئێوەی نەخشاندووە، کردوونی بە ڕێك و پێك ترین گیانلەبەر لەسەر ڕووی زەویدا، هەروەها کردوونی بە بەرزترین و بەڕێزترین گیانلەبەر لە ڕووی تێگەیشتنەوە هەروەکو ئەوە وایە خوای گەورە بفەرموێت: ئەی ئادەمیزاد من ئابەو شێوەیە ئێوەم دروستکردووە دەی ئێوەش مەیشێوێنن و بەردەوام هەوڵبدەن بەجوانی بی هێڵنەوە و پارێزگاری لێ بکەن..جا ئەگەر موسڵمان ئاوەها بوو شایەنی ئەوەیە دەستی بۆ درێژ بکرێت کە مرۆڤێکی پاك و خاوێنە، گوێ لە بیرو بۆچوونەکانی دەگیرێ و مرۆڤێکی سوپاس کراو دەبێ، خۆ ئەگەر واش نەبوو ئەوا بە پێچەوانەوە نە گوێی لێ دەگیرێ و نە کەسیش سوپاسی دەکات[١].

ئیمام حەسەن (رەحمەتی خوای لێ بێ) کاتێك دەچوو بۆ نوێژ چاکترین و پاك و خاوێنترین جل و بەرگی لەبەر دەکرد، لێیان پرسی لەو بارەوە؟. فەرمووی: (إنّ اللهَ جميلٌ يُحبُّ الجَمالَ). خوای گەورە شتی جوانی پێخۆشە بۆیە منیش پێم خۆشە خۆم جوان بکەم. خوای گەورەش پێی خۆشە جل و بەرگتان جوان بێ و پاك و خاوێن بێت پێڵاوی جوان لە پێ بکەن و سیماشتان جوان بێ.

---

(١) فتح الباري شرح صحيح البخاري.

پێشەوا شافیعی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرموێ: ئەوەی جل و بەرگی خاوێن بێ غەم و پەژارەی کەم دەبێت و ئەقڵی زیاد ئەبێ [1].

ئەو شتانەی دەبنە هۆی پاك و خاوێنی:

**یەکەم: چوونە سەرئاو یان تارەتگرتن:** بێگومان تارەتگرتن واجبە بەناو یان بە سێ بەرد یاخود بەهەردووکیان، خوای گەورە ئەم مرۆڤەی وا دروستکردووە هەر لە سەرەتاوە کە خۆی ڕزگار بکات لە هەرچی لە ناو میزڵدان و ڕیخۆڵە کانیدایە لە میزو پیسایی، هەروەها لە پاشماوەکانی جەستە خۆی خاڵی بکاتەوە و پاك ببێتەوە. تا هەمیشە پاك وخاوێن و تەندروست و چالاك بێ و، توانای ئەنجامدانی کارەکانی هەبێ.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُوا وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُطَّهِّرِينَ ﴾ التوبة: ١٠٨. واتە: ئەو مسڵمانانەی خوا پەرستی تیا دەکەن و بە نوێژ کردن ئاوەدانی دەکەنەوە، دەیانەوێت خۆیان پاك ڕابگرن، خوداش ئەو کەسانەی خۆش دەوێت خۆیان پاك ڕادەگرن..

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (إِنَّ عَامَّةَ عَذَابِ القَبرِ مِنَ البول، فتَنَزَهُوا مِنْهُ)[2]. واتە: زۆربەی سزای گۆڕ لەسەر خۆ پاك نەکردنەوەیە لەپاش میزکردن، خۆتان پاك بکەنەوە و لەپاش دانیشتن لەسەر ئاو.

پێغەمبەی خوا ﷺ لەکاتی دانیشتن لەسەر ئاو دوور دەکەوتەوە لەبەر چاوی خەڵك، لەدەرو دەشتدا نە ڕووی لە ڕووگە دەکرد و نە پشتیشی تێدەکرد، بە دەستی چەپ خۆی پاك دەکردەوە، دەستی چەپی تایبەت کردووە بۆ خۆپاك کردنەوە و، دەستی ڕاستیش بۆ خواردن و خواردنەوە.

* ئیبن عەبباس (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو فەرمووی: (إتَّقوا مَلاَعِنَ الثَلاثَ: أنْ يَقْعُدَ اَحَدُكُمْ في ظِلٍ يَستَظَلُّ فِيهِ، أوفى طَرِيقٍ أو فى نَقعِ

---

(١) إحياء علوم الدين: ١ /٤١٥.

(٢) رواه عبد الحميد، والبزار، والحاكم وصححه الألباني في الإرواء: ٣١١/١.

(٣)رواه أبو داود: (٢٦)، وأحمد: (٢٩٩/١)، صحيح جامع: (١١٣).

ماء)[1]. واتە: خۆتان بپارێزن لەوسێ شتەی نەفرەتیان لێکراوە: پیسایی کردنە سێبەری ئەو درەختانەی خەڵکی لە ژێریدا دەحەوێنەوە، یان پیسایی کردنە سەر ڕێگای سەرەکی خەڵك، یاخود ئاو حەوز و بیری ئاو و ئەو دەفرەی ئاوی تێدایە خەڵك ئاوی لێ دەبەن بۆ بەکارهێنان.

* سوننەتە لەکاتی چوونە سەرئاو قاچی چەپ پێش بخرێ و ئەم دوعایە بخوێنرێت: (اللهم إني أعوذ بك من الخبث والخبائث)[2].

* سوننەتە لەکاتی هاتنە دەرەوەدا قاچی ڕاست پێش بخرێ و ئەم دوعایە بخوێنرێت: (غُفرانَكَ)[3].

**دووەم: خۆشتن**:شتنی هەموو جەستەیە لەگەڵ نیەت هێنان، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقۡرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمۡ سُكَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعۡلَمُواْ مَا تَقُولُونَ وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِي سَبِيلٍ حَتَّىٰ تَغۡتَسِلُواْ ﴾النساء: ٤٣. واتە: ئەی ئەوکەسانەی ئیمانتان هێناوە لەکاتی سەرخۆشیدا نزیکی نوێژ مەکەونەوە، تاسەر خۆشیەکاتان دەڕوات بۆ ئەوەی بزانن چی دەڵێن.. ئەگەر لەشیشتان گرانبوو نوێژمەکەن مەگەر ڕێبوار بن لە سەفەردا، هەتا خۆتان دەشۆن.

بێگومان ئەوانەی ڕیبواربن یان لە سەفەردا بوون ئەگەر ئاویان دەست نەکەوت پێویستە لە سەریان تەیەموم بکەن.

هەروەها خوای گەورە فەرمانی کردووە بە ئەیوب عليه السلام: ﴿ ٱرۡكُضۡ بِرِجۡلِكَۖ هَٰذَا مُغۡتَسَلُۢ بَارِدٞ وَشَرَابٞ ﴾ ص: ٤٢. واتە: ئێمەش فەرمانمان پێکرد کە قاچت لە زەوی بدە.. قاچی لەزەویدا ئاوێکی ڕوونی لێ هەڵقوڵاو، پێمان ڕاگەیاند کە ئەمە ئاوێکی سارد و سازگارە بۆ خۆشتن و بۆ خواردنەوەش، جا خۆتی پێ بشۆ و لێشی بخۆرەوە.

(١) صحيح جامع الترمذي: ١/١١ برقم: ٦ .

(٢) صحيح جامع الترمذي: ١/١٢ برقم: ٧.

خۆشتن بایەخێکی گەورەی هەیە، چارەسەری زۆر لە نەخۆشیەکان دەکات، بەڵام هیچ گەلێك نەیتوانیوە وەك ئیسلام بەرنامەیەکی گونجاو و رێك و پێکی بۆ دابنێ، خوای گەورە و کاربەجێ هەر پێش ئەوەی موسڵمانان شایەتومان بهێنن فەرمانیان پێدەکات خۆیان بشۆن، هەروەها فەرمانی پێکردوون لەدوای جووت بوون خۆیان بشۆن.

هەروەها واجبە لەسەر ئافرەتان لەدوای حەیز و زەیستانی خۆیان بشۆن بۆ ئەوەی پاك ببنەوە، خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ ﴾البقرة: ٢٢٢. واتە: مەچنە لایان تا پاك دەبنەوە و خۆیان دەشۆن.

پێویستە لەسەر موسڵمانان بەیانی هەموو رۆژێکی هەینی و هەردوو چەژنەکان خۆیان پاك بشۆن بۆ ئەوەی پاك و خاوێن بن لەو قەڵەباڵغیەدا نەبنە زەحمەت بۆ موسڵمانان.

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (حَقٌّ على كُلِّ مُسْلِمٍ أن يَغسِلَ في كُلِّ سَبْعَةِ أَيَّامٍ يَوماً يَغْسِلُ فِيهِ رَاسَهُ وَجَسَدَهُ)[1]. واتە: حەقەو پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانێ لە هەفتەیەکدا جارێ سەرو جەستەی پاك بشوات.

**سێیەم: تەیەممووم**: ئەگەر کەسێك ئاوی دەست نەکەوت، یان ترسی ئەوەی هەبێ بە بەکارهێنانی ئاو زیانی لێ دەکەوێ، ئەوە لەو حاڵەتەدا بۆی هەیە لەجیاتی خۆشتن بۆ لەش گرانی و دەستنوێژ تەیەمموم بکات بە گڵێکی پاك.

واتە: نیەت بهێنێ و هەردوو دەست بدا لە گڵێکی پاك و مەسحی روومەت و هەردوو دەستی پێبکا. ئەو کاتە هەر شتێك بەدەستنوێژەوە حەڵاڵ بێ بۆی حەڵاڵ دەبێت.

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰ أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوْ جَاءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ الْغَائِطِ أَوْ لَامَسْتُمُ النِّسَاءَ فَلَمْ تَجِدُوا مَاءً فَتَيَمَّمُوا صَعِيدًا طَيِّبًا فَامْسَحُوا بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُم مِّنْهُ مَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُم مِّنْ حَرَجٍ ﴾ المائدة: ٦. واتە: ئەگەر لەش گران بوون ئەوە خۆتان بشۆن و خۆتان خاوێن بکەنەوە، ئەگەر نەخۆش بوون یان لەسەفەردا بوون، یان چوونە سەرئاو، یان چوونە لای هاوسەرتان ئاوتان دەست نەدەکەوت بۆ خۆشتن یان

(١) البخاري: (٨٩٧)، ومسلم: (٨٤٩).

دەستنوێژ گرتن ئەوە تەیەمموم بکەن بە خاکێکی پاك، ناولەپتان بدەن لە خۆڵە پاکەکە و بیهێنن بەدەم و چاوتاندا بەو تۆز و خۆڵە پاکە، خودا کارتان بۆ ئاسان دەکات و نایەوێت توشی سەغڵەتی و زەحمەتتان بکات..

**چوارەم: دەستنوێژ (الوضوء):** دەستنویژ یەکێکە لە مەرجەکانی نوێژ و بەبێ ئەویش نوێژ بەتاڵە، دەستنوێژ نیعمەتێکی خواییە بەخشراوە بەم ئوممەتە و فەرمانی پێکراوە و پاداشتێکی زۆریشی لەسەر وەردەگیرێت، موسڵمان پێش ئەوەی دەست بکات بە نوێژ کردن پێویستە لەسەری دەستنویژ بگرێ و جەستەی پاك و خاوێن بێ و لەش گران نەبێ.

دەستنوێژ (الوضوء): پێشەوا نەوەوی دەفەرموێت: لە وشەی (الوضاء) وەرگیراوە بە مانای جوانی و پاك وخاوێنی دێت.

لە شەرعدا: بریتیە لە شتن و پاك کردنەوەی ڕووخسار و، هەردوو دەست تا ئانیشکەکان، مەسحی سەر، شتنی هەر دوو پێ تا قولە پێکان.

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ إِلَى ٱلۡمَرَافِقِ وَٱمۡسَحُواْ بِرُءُوسِكُمۡ وَأَرۡجُلَكُمۡ إِلَى ٱلۡكَعۡبَيۡنِ﴾ المائدة: ٦

واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە کاتێك هەستان بۆ نوێژکردن، ئەوە ڕووخسارتان بشۆن، هەروەها دەستەکانتان تا ئانیشکەکانتان، پاشان دەستی تەڕ بهێنن بەسەرتاندا، پێکانتان بشۆن تا هەردوو قولەپێتان..

* ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی: (لا تقبل صلاة من أحدث حتى يتوضأ )[1]. واتە: ئەو کەسەی دەستنوێژی دەشکێ نوێژەکەی وەرناگیرێت هەتا دەستنوێژ نەگرێتەوە.

دەستنوێژ چەکی موسوڵمانانە، هۆی گوناە شۆردنەوەیە، پێشەکی یە بۆ ئەنجامدانی گەورەترین عیبادەت کە نوێژە، بە تەنها شۆردنی چەند ئەندامێك نیەو بەس، بەڵکو کاریگەری دەروونی هەیەو بەرزێتی ڕۆحە کە موسڵمان هەستی پێدەکات لەپاش دەستنوێژ

---

(١) متفق عليه.

گرتن، دەستنوێژ زۆر لەوە گەورەترە بەچەند وشەیەك تەعبیری لێ بکرێت، بەتایبەتی ئەگەر بەدڵنیایی و بەباوەڕەوە بگیرێت کاریگەری باشی دەبێت لەسەر ژیانی موسڵمان، هەمیشە و دایم هۆشیاری دەکاتەوە و سیمای جوان دەکات، وەرزشە بۆ جەستەی و چوست و چالاکی دەکات، ئیمان زیاد دەکا، زیهن چالاك دەکاتەوە بۆ ئەوەی ئامادەبێ بۆ پەیوەندی کردن بەخواوە، بەو خاوێنیِ یە بەندە چێژ لە عیبادەت و نوێژەکانی وەردەگرێ، هێمن و ئارام دەبێ و، دڵەڕاوکێ و تووڕەبوون ناهێڵێ، چونکە تووڕەبوون لە شەیتانەوەیە..

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (إذا توضأ العبد المسلم (أو المؤمن) فغسل وجهه، خرج من وجهه كل خطيئة نظر إليها بعينيه مع الماء (أو مع آخر قطر الماء) فإذا غسل يديه خرج من يديه كل خطيئة كان بطشتها يداه مع الماء (أو مع آخر قطر الماء) فإذا غسل رجليه خرجت كل خطيئة مشتها رجلاه مع الماء (أو مع آخر قطر الماء) حتى يخرج نقيا من الذنوب)[1]. واتە: کاتێك بەندەی موسڵمان - یان بەندەی باوەڕدار- دەستنوێژ دەگرێت ئەو گوناهانەی بە چاوەکانی کردوونی لەگەڵ چۆڕاوگەی ئاوی دەستنوێژەکەدا دەوەرن یا لەگەڵ دوا دڵۆپی ئاوەکەدا دادەکەون و دەڕۆن، کەدەستی دەشوات ئەو گوناهانەی بە دەستەکانی کردوونی لەگەڵ چۆڕاوگەی ئاوی دەستنوێژەکەدا دەوەرن یا لەگەڵ دوا دڵۆپی ئاوەکەدا دادەکەون و دەڕۆن، کە هەردوو قاچی دەشوات هەروەها.. هەتا پاك دەبێتەوە لە گوناه.

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (إِنَّ أُمَّتِي يُدْعَوْنَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ غُرًّا مُحَجَّلِينَ مِنْ آثَارِ الْوُضُوءِ، فَمَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمْ أَنْ يُطِيلَ غُرَّتَهُ فَلْيَفْعَلْ). واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا ئوممەتی من بانگیان دەکەن(غرا محجلين) چونکە ڕووخسار و ئەو شوێنانەی ئاوی دەستنوێژ بەری کەوتووە سپی و ڕووناکن و دەدرەوشێنەوە بە هۆی ئاسەواری دەست نوێژەوە[2].

(١) أخرجه مسلم: (٢٤٤) و صححه الألباني في الجامع الترمذي: (١/٦).

(٢) أخرجه البخاري: (١٣٦)، ومسلم: (٣٥).

* پێغەمبەری خوا دەفەرمویێت: (مَنْ تَوضَأ فأحْسَنَ الوَضُوء خَرجَتْ خَطاياهُ مِن جَسَدِهِ حَتى تَخرُجَ مِن تَحْتِ أظفَارِهِ)[1]. واتە: هەرکەسێك دەستنوێژێك بەچاکی بگرێت، گوناهەکانی لە جەستەی دەردەچن، هەتا لەژێر نینۆکەکانیەوە دەچنە دەرەوە.

* عوسمانی کوڕی عەففان (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بە چاوی خۆم دیم پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنوێژێکی گرت دەق وەك ئەم دەست نوێژەی من و فەرمووی: (من توضأ هكذا غفر له ما تقدم من ذنبه، وكانت صلاته ومشيه إلى المسجد نافلة)[2]. واتە: هەر کەسێك دەستنوێژێکی ئاوا بگرێت خوای گەورە لە هەرچی گوناهی ڕابردووی هەیە خۆش دەبێت، ئیتر چوون بۆ مزگەوت و نوێژەکەی بە خێری زیادە بۆ دەنوسرێت چونکە گوناهی نەماوە تا ببێتە کەفارەتی!.

* ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (أَلاَ أَدُلُّكُمْ عَلَى مَا يَمْحُو اللَّهُ بِهِ الْخَطَايَا وَيَرْفَعُ بِهِ الدَّرَجَاتِ). قَالُوا بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ (إِسْبَاغُ الْوُضُوءِ عَلَى الْمَكَارِهِ وَكَثْرَةُ الْخُطَا إِلَى الْمَسَاجِدِ وَانْتِظَارُ الصَّلاَةِ بَعْدَ الصَّلاَةِ فَذَلِكُمُ الرِّبَاطُ، فَذَلِكُمُ الرِّبَاطُ،فَذَلِكُمُ الرِّبَاطُ)[3]. واتە: شتێکتان فێردەکەم ئەگەر کردتان گوناهتان هەڵدەوەرێنێ و پلەتان بەرزدەکاتەوە؟. وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ!. فەرمووی: دەستنوێژ گرتن لە کاتی ناخۆشیدا، وەك ساردی ئاو کە دوور بێت و بەزەحمەت بگەنە لای، یان لەکاتی باران بارین و نەخۆشیدا، زۆر هەنگاو نان بەرەو مزگەوتەکان، چاوەڕوانی نوێژ لە دوای نوێژ، ئا ئەوەیە سەنگەرگرتن بۆ خەبات و تێکۆشان، ئا ئەوەیە سەنگەر گرتن، ئا ئەوەیە سەنگەر گرتن.

* عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك دەستنوێژێکی جوان بگرێت پاشان بڵێ: (أشهد أن لا إله إلا الله وأن محمدا عبد الله ورسوله، إلا فتحت له أبواب الجنة الثمانية، يدخل من أيها شاء)[4]. هەر

---

(١) أخرجه البخاري: (١٥٤)، ومسلم: (٦٤٤).

(٢) رواه مسلم في الطهارة: (٣٣) .

(٣) أخرجه مسلم: (٢٥١)، (٦١٠).مسلم في الطهارة: (١٧)، وأحمد: (١٤٥/٤).

(٤) رواه الترمذي: (٥٥) صحيح، جامع الترمذي: (٧٨/١)

هەشت دەرگاکەی بەهەشتی بۆ دەکرێتەوە، لەهەر کامیانەوە بیەوێت بچێتە ژوورەوە ئارەزووی خۆیەتی. هەروەها بڵێت: (اللّهُمَّ جعَلْني مِنَ التوّابينَ واجعَلْني مِنَ المُـتَطهرينَ). واتە: خودایە بماخەیتە ڕیزی ئەو کەسانەی تەوبەکارن و ئەو کەسانەش کە خۆیان خاوێن ڕادەگرن.

عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێت: دەستنوێژی چاك شەیتان دوور دەخاتەوە [1].

عەلی کوڕی حوسەین (ڕەزای خوای لێ بێ) کاتێك دەستنوێژی دەگرت ڕەنگی زەرد هەڵئەگەڕا، لێیان پرسی لەو بارەوە؟. فەرمووی: ئەی ئایا نازانن لەبەردەم کێدا ڕادەوەستم؟! [2].

پێشەوا موجاهید (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرموێت: ئەوەی توانای هەیە و پێی دەلوێ با هەمیشە و بەردەوام دەسنوێژی هەبێ و تەوبە بکات(استغفر الله) زۆر بڵێ، چونکە کاتی ڕۆح کێشان خەریکی چی بێت بەو شێوەیە زیندوو دەکرێتەوە [3].

**پێنجەم: سیواککردن:** سیواك ئەو دارەیە کە دەهێنرێت بەناو دەم و ددانەکانی مرۆڤدا بەمەبەستی بۆن خۆشی و پاککردنەوەی.

سیواك کردن دەبێتە هۆی هۆشیار بوونەوە و وریایی، نەهێشتنی بۆنی ناودەم، توندو تۆڵ کردنەوەی پوك، کەم کردنەوەی ڕێژەی کلۆر بوونی ددانەکان، یارمەتی دانی هەرسکردنی خۆراك و چەندەها سوودی تر.. سوننەتە لەکاتی لەخەو هەستان و دەستنوێژ گرتن و نوێژ کردن و قورئان خوێندندا سیواك بەکار بهێنرێت.

ئیبن قەیم (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: زێدەڕەوی لە سیواك کردندا قەتاغەی ددانەکان لادەبات و جوان و بەهێزیان دەکات، لە کلۆربوون دەیانپارێزێت، بۆنی خۆشەو، دەماغ و هەست ساف دەکات و، ئارەزووی خواردن زیاد دەکات.

---

(١) إحياء علوم الدين لإمام الغزالي: (١/٣١٥).

(٢) إحياء علوم الدين لإمام الغزالي: (١/٣٥٠).

(٣) إحياء علوم الدين لإمام الغزالي: (١/٣١٥).

* پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر سور بووە لەسەر بەکارهێنانی سیواك، کاتێك لەخەو خەبەری دەبووەوە پێش هەموو شتێك سیواکی دەکرد: (إذا استيقظ من الليل يشوص فاه بالسواك)[1].

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمویێت: (السواك مطهر للفم مرضاة للرب)[2]. واتە: سیواك کردن دەبێتە هۆی پاككردنەوەی دەم و ددان و، ڕەزامەندی خوای گەورە.

* پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك بیویستایە قورئانی بخوێندایە سیواکی دەکرد: (طهروا أفواهكم للقرآن)[3].

* ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموی: پێغەمبەری خوا فەرمویەتی: (لَوْلاَ أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي لأَمَرْتُهُمْ بِالسِّوَاكِ عِنْدَ كُلِّ صَلاَةٍ)[4]. واتە: ئەگەر سیواك کردن بارگرانی نەبوایە لەسەر ئوممەتم، ئەوا فەرمانم پێدەکردن سیواك بەکاربهێنن لەگەڵ هەموو نوێژێکدا.

---

(١) متفق عليه.البخاري:١/٧٠(٢٤٥) ومسلم: ١/١٥١(٢٥٥).

(٢) أخرجه النسائي١/١٠(٥)وابن خزيمة في صحيحه: ١٣٥،صحيح الجام(٣٦٩٥).

(٣) رواه البزار: (٢٤٢/١)، و قال الألباني إسناده جيد، في الصحيحه: (١٢١٣).

(٤) أخرجه البخاري: ( ٨٨٧)، ومسلم: (٢٥٢).

مُحَمَّدًا الْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ وَابْعَثْهُ مَقَامًا مَحْمُودًا الَّذِى وَعَدْتَهُ) شەفاعەتی بۆ دەکەم لە قیامەتدا.

خوای گەورە دەفەرمویت: ﴿ وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَتَهَجَّدۡ بِهِۦ نَافِلَةً لَّكَ عَسَىٰٓ أَن يَبۡعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَّحۡمُودًا ﴾ الإسراء: ٧٩. واتە: ئەی پێغەمبەر! لە بەشێکی شەوگاردا خۆت ماندوو بکە و قورئان بخوێنە، کەزیادە ئەرکێکە لەسەر تۆ، بۆ ئەوەی پەروەردگارت پایەو مەقامە بەرزەکەت پێ ببەخشێت، هەندێك لە زانایان دەڵێن مەبەست لە(مقاما محمودا) پایەی شەفاعەتی گەورەیە لە قیامەتدا.

* مەعاویە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو فەرمووی: (الْمُؤَذِّنُونَ أَطْوَلُ النَّاسِ أَعْنَاقًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ)[1]. واتە: بانگدەران لە قیامەتدا گەردنیان لە گەردنی هەموو کەس درێژ ترە.

* هەرچی گوێی لە بانگدەر بێت بۆی دەپاڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (لا يَسمَع صوته شَجر وَلا مَدر ولا حَجر ولا جن وَلا إنس إلا شَهِدَ لَه)[2]. واتە: دار و بەرد وخاك وخۆڵ و جنۆکە و مرۆڤ شایەتی بۆ بانگدەر دەدەن.

*ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا صلى الله علية وسلم فەرمویەتی:( إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَاةِ أَدْبَرَ الشَّيْطَانُ وَلَهُ ضُرَاطٌ حَتَّى لَا يَسْمَعَ التَّأْذِينَ فَإِذَا قَضَى النِّدَاءَ أَقْبَلَ حَتَّى إِذَا ثُوِّبَ بِالصَّلَاةِ أَدْبَرَ حَتَّى إِذَا قَضَى التَّثْوِيبَ أَقْبَلَ حَتَّى يَخْطِرَ بَيْنَ الْمَرْءِ وَنَفْسِهِ يَقُولُ اذْكُرْ كَذَا اذْكُرْ كَذَا لِمَا لَمْ يَكُنْ يَذْكُرُ حَتَّى يَظَلَّ الرَّجُلُ لَا يَدْرِي كَمْ صَلَّى)[3]. واتە: ئەگەر بانگ درا شەیتان هەڵدێ بە تڕ لێدان، بۆ ئەوەی بانگەکە نەبیستێ، کە بانگەکە تەواو بوو دێتەوە تا قامەت دەکرێ دیسان هەڵ دێتەوە، کە قامەت تەواو بوو دێتەوە وەسوەسە دەخاتە دڵی نوێژخوێنەوە داڵغە بۆ نوێژخوێنەکە دروست دەکات، پێی دەڵێ: یادی ئەوە و ئەوە بکە کە پێشتر لە یادی نەبوو تاوای لێ دەکات نازانێ چەند ڕکات

---

(١) أخرجه مسلم: ٨٧٨.

(٢) صحيح الترغيب والترهيب: ٢٣٢، وصححه ابن الخزيمه.

(٣) أخرجه البخاري: (٦٠٨).

نوێژی کردووە. لە ڕیوایەتی پێشەوا (مسلم)دا هاتووە: (وا لە نوێژخوێن دەکات کە نەزانێ چۆن نوێژەکەی دەکات).

* ئەنەس فەرمووی: پێغەمبەری خوا فەرمویەتی: (لا يُرَدُّ الدُعاء بَيْن الأذَان والإقامة)[1]. واتە: نزا و پاڕانەوەی نێوان بانگ و قامەت نادرێتە دواوە.

وشەکانی قامەت بریتین لە: (اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ ، حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ ، حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ ، حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ ، قَدْ قَامَتْ الصَّلاَةُ ، قَدْ قَامَتْ الصَّلاَةُ ، اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ لاَ إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ)[2].

ئەبو بەکری صدیق (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمویەتی: گوێچکەی ئادەمیزاد پڕبێ لە قوڕقوشم باشترە لەوەی گوێی لە بانگ بێ و نەچێت بەدەمیەوە[3].

دەگێڕنەوە سەعیدی کوڕی موسەیب (بەڕەحمەت بێ) بیست ساڵی ڕەبەق ئامادەی بانگدان بووە لە مزگەوتدا[4].

## مەرجەکانی نوێژ:

مەرجەکانی نوێژ: ئەو واجبانەن کە بەشێك نین لە نوێژ، بەلاّم مەرجن بۆ دروست بوونی نوێژ، ئەگەر یەکێکیان نەبێت نوێژەکە دروست نابێت.

١- پێویستە موسڵمان بێت.

٢- عاقلّ بێت، شێت نەبێت.

٣- بالّغ بێت، واتە: چاك و خراپ لێك جیابکاتەوە.

٤- پاك وخاوێنی، واتە: پاك وخاوێنی جەستە و جل و بەرگ و شوێنی نوێژ کردنەکە.

---

(١) رواه الترمذي: (٥٢١)، قال الألباني صحيح في سنن أبوداود: ١/١٤٤، برقم: ٥٢١.

(٢) صحيح سنن أبي داود: (١/١٤١).

(٣) إحياء علوم الدين مجلد: ١.

(٤) إحياء علوم الدين: ١/٣٤٥.

٥- داپۆشینی عەورەت: پیاو لە ئەژنۆوە تا ناوکی داپۆشراو بێت نوێژەکەی دروستە، بەڵام عەورەتی ئافرەت هەموو جەستەیەتی جگە لە ڕووخسار و هەردوو لەپی دەستی: ﴿يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ﴾ الأعراف: ٣١. واتە: ئەی نەوەی ئادەم خۆتان برازێننەوە لە کاتی هەموو نوێژێکدا. ئیبن عەبباس (ڕەزای خوایان لێ بێ) دەفەرموێت: مەبەست لە زینەت پۆشاکە لە نوێژدا.

٦- زانینی کاتی نوێژەکان: ﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتۡ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ كِتَٰبٗا مَّوۡقُوتٗا﴾ النساء: ١٠٣) واتە: بەراستی نوێژ بۆ باوەڕداران فەرزێکی کات بۆ دیاریکراوە.

أ- نوێژی بەیانی: دوو ڕکاتە، یەك تەحیاتی تێدا دەخوێنرێت، کاتەکەی لە دوای بانگی بەیانییەوە دەست پێدەکات تاکو خۆرهەڵاتن.

ب- نوێژی نیوەڕۆ: چوار ڕکاتە، دوو تەحیاتی تێدا دەخوێنرێ، کاتەکەی لە دوای بانگی نیوەڕۆوە تا بانگی عەسرە، واتە: یەکەم کاتی لادانی خۆرە لە ناوەڕاستی ئاسمان بەرەو لای ڕۆژئاوا تاکو سێبەری هەموو شتێك بە ئەندازەی خۆی لێ دێتەوە.

ج- نوێژی عەسر: چوار ڕکاتە، دوو تەحیاتی تێدا دەخوێنرێت، کاتەکەی لە دوای بانگی عەسرەوە تا بانگی شێوانە، یەکەم کاتی ئەو کاتەیە کە سێبەری هەموو شتێك هەندێك لە سێبەری خۆی زیاتر بێت، دوا کاتیشی تا خۆر ئاوابوونە.

د- نوێژی شێوان (مەغریب): سێ ڕکاتە، دوو تەحیاتی تێدا دەخوێنرێت، لە دوای بانگی شێوانەوە دەست پێدەکات تا بانگی عیشا، یەکەم کاتی ئەوەیە کە خۆر ئاوا دەبێت تا سورایی خۆر دەمێنێتەوە هەر بەردەوامە.

هـ- نوێژی خەوتنان (عیشا): چوار ڕکاتە، دوو تەحیاتی تێدا دەخوێنرێت، کاتەکەشی لە دوای بانگی عیشاوە تا بانگی بەیانییە، بەڵام هەندێك لە زانایان ڕەییان وایە تا نیوە شەو دەمێنێت.

٧- ڕووکردنە ڕووگە (قیبلە): ﴿فَوَلِّ وَجۡهَكَ شَطۡرَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِۚ وَحَيۡثُ مَا كُنتُمۡ فَوَلُّواْ وُجُوهَكُمۡ﴾ البقرة: ١٥٠. واتە: لە هەر شوێنێکدا بوون ڕووی خۆتان هەڵسوڕێنن بۆ مزگەوتی (الحرام) کەعبەی پیرۆز، لەهەر شوێنێکدا بوون ڕوو بکەنە ڕووگە.

٨- دانانی بەربەست (السترة ): بەربەستێك لەبەردەم جێگا سەجدەکەدا دابنرێت بۆ ئەوەی کەس نەدات بە بەردەم نوێژخوێندا.

# روکنەکانی نوێژ :

روکنەکانی نوێژ ئەو واجبانەن کە بەشێکن لە نوێژ و نوێژیان لێ پێك دێت، ئەگەر یەکێکیان نەبێ نوێژەکە دروست نابێت و بەتاڵە.

١- نیەت هێنان بە دڵ: پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: (إنَّما الاعمالُ بالنِيّات، و إنَّما لكُل امرىءٍ ما نوى..)[١]. واتە: هەموو کردەوەیەکی خواپەرستی، بەبێ نیەت هێنان دانامەزرێت، هەموو مرۆڤێك تەنها پاداشتی ئەو کردەوەیەی هەیە کە نیەتی بۆ هێناوە..

٢- راوەستان بۆ ئەو کەسەی توانای هەیە:﴿وَقُومُواْ لِلَّهِ قَـٰنِتِينَ ﴾ البقرة: ٢٣٨. واتە: بەردەوام هەستن بە ئەنجامدانی فەرمانەکان بۆ خوا بە گەردن کەچییەوە.

* پێغەمبەری خوا ﷺ بە عیمرانی فەرموو: (صَلِّ قائماً، فَإن لَم يَستَطِيع فَقاعِداً، فَإن لَم يستَطِع فَعلَى الجنب)[٢]. واتە: نوێژ بکە بە پێوە، ئەگەر توانات نەبوو بە دانیشتنەوە، ئەگەر بەدانیشتنیشەوە توانات نەبوو، لەسەر تەنیشت نوێژکەت بکە.

زانا موجتەهیدەکان یەك دەنگن لەسەر ئەوەی کە ڕاوەستان بە پێوە بۆ خوێندنی سورەتی فاتیحە روکنێکە لە روکنەکانی نوێژ، بۆ ئەو کەسەی توانای هەیە.

٣- وتنی (اللّٰه اكبر)ی نوێژ دابەستن: پێغەمبەری خوا ﷺ بەو پیاوەی نوێژەکەی تەواو نەبوو فەرمووی: (إذا قُمتَ الى الصَّلاة فَكبِّر).

هەروەها دەفەرموێت: (مِفتاحُ الصَّلاة الطهور، وتَحريمُها التكبير، وتحلُلها التَسليم)[٣]. واتە: کلیلی نوێژ پاك وخاوێنی و دەستنوێژە، دابەستنیشی بە (اللّٰه اكبر)ە، بە سڵاودانەوەش تەواو دەکرێت.

---

(١) أخرجه البخاري: (١) ومسلم :(١٩٠٧).

(٢) أخرجه البخاري: (١١١٧) وأبو داود: (٩٣٩) والترمذي: (٣٦٩).

(٣) رواه أبو داود:(٦١) الترمذي: (٣) وصححه الألباني في الارواء: (٣٠١).

٤- خوێندنی سورەتی فاتیحە لە هەموو رکاتێکدا: پێویستە ئایەت بە ئایەت بخوێنرێت و ئایەتەکان درێژ بکەنەوە و بوەستن لە سەریان.

٥- رکوع بردن: واتە چەمینەوە بەجۆرێك بێت بەری دەستەکان بگاتە سەر ئەژنۆ، ئەوەندە بمێنێتەوە تا ئارام دەبێت و جەستەی لە جولە دەکەوێت، سێ جار بڵێت: (سُبحَانَ ربِّي العَظِيمِ وَبِحَمدِهِ)[1]. واتە: تەسبیحات و پاکی و بێگەردی شایستەی پەروەردگاری مەزن و شکۆمەندی منە و سوپاسیشی دەکەم.

أ- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱرۡكَعُواْ وَٱسۡجُدُواْ وَٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمۡ ﴾ الحج: ٧٧.

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە بە خوداو بە پێغەمبەری خوا! ئێوە رکوع و سەجدە بۆ خودا ببەن، پەروەردگاتان بپەرستن لە هەموو بارو دۆخێکدا.

ب- پێغەمبەری خوا ﷺ بەو پیاوەی نوێژەکەی تەواو نەبوو فەرمووی: (ثُمَّ اركَع حتَّى تَطمَئِنَّ راكِعاً). واتە: رکوع ببەو ئەوەندە بمێنەوە لە رکوعدا تا ئارام دەبیتەوە.

سوننەتە ئەم زیکرو دوعایانە لە رکوعدا بخوێنرێن:

أ- (سُبحانَكَ اللّهُمّ ربَّنا وَ بحَمدكَ اللّهُمَّ اغفر لي)[2].

ب- (سُبُّحٌ قُدُّس ربُّنا وَ ربُّ المَلائكَةِ وَ الروح)[3].

٦- راست بوونەوە لە رکوع: ئەوەندە بوەستە تا ئارام دەبیتەوە، پاشان بڵێ: (سَمِعَ اللّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنا وَلَكَ الْحَمْدُ)[4]. واتە: خوای گەورە بیسەری سوپاسگوزاری ئەوانەیە سوپاسی دەکەن، پەروەردگارا سوپاس و ستایش بۆ تۆ.

٧- سەجدە بردن: بریتییە لە خستنە سەر زەوی بەرزترین شوێنی جەستە کە ناوچاوانە، لەگەڵ هەردوو ناو لەپ و هەردوو ئەژنۆ، سێ جار بڵێت: (سُبحانَ ربِّي الاعلى

(١) أخرجه الترمذي: (٢٦٢)، وأبو داود: (٨٧١).

(٢) أخرجه البخاري: (٢/٢٤٧)، ومسلم: (٤٨٤).

(٣) أخرجه مسلم: (٤٨٧)، وأبو داود: (٨٧٢).

(٤) أخرجه البخاري: (٦٨٩)، ومسلم: (٣٩٢).

وبحَمدِه)[1]. واته: تەسبیحات و پاکی و بێگەردی شایستەی پەروەردگاری بەرز و بڵندی منە و سوپاسیشی دەکەم.

أ- ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱرۡكَعُواْ وَٱسۡجُدُواْ وَٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمۡ﴾ الحج: ٧٧. واته: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە بە خوداو بە پێغەمبەری خوا! ئێوە رکوع و سەجدە بۆ خودا ببەن، پەروەردگاتان بپەرستن لە هەموو بارو دۆخێکدا.

ب- پێغەمبەری خوا ﷺ بەو پیاوەی نوێژەکەی تەواو نەبوو فەرمووی: (ثُمَّ اسجُدحتَّى تَطمَئِنَّ ساجِداً). واته: سەجدە ببە و هێندە لە سەجدەدا بمێنەرەوە تا ئارام دەبیت.

سوننەتە ئەم زیکر و دوعایانەش لە سەجدەدا بخوێنرێن:

أ- (سُبحانَكَ اللَّهُمَّ رَبَّنا وَ بِحَمدِكَ اللَّهُمَّ اغفِر لي)[2].

ب- (سُبُّحٌ قُدُّس رَبُّنا وَ رَبُّ المَلائكَةِ وَ الروح)[3].

٨- دانیشتنی نێوان دوو سەجدەکە: ئەوەندە بمێنەوە تا جەستەت لە جوڵە دەکەوێت..

سوننەتە ئەم دوعایەش بخوێنیت:

أ- (اللَّهُمَّ اغفِر لِي و ارحَمني و اجبرني و اهدني و ارزقني)[4].

ب- (رَبِّ اغفِر لِي.. ربِّ اغفرلي..)[5].

٩,١٠- دانیشتن و خوێندنی تەحیات: لە دوای هەموو دوو رکات نوێژێکەوە تەحیاتێك دەخوێنرێت: (التَّحيَّاتُ للّه، وَالصَّلَواتُ،والطَّيِّباتُ، السَّلامُ عَلَيكَ أَيُّها النَّبيُّ وَ رَحمَةُ اللّهِ وَ بَرَكاتُهُ، السَّلامُ عَلَينا وَ علَى عِبادِ اللّه الصَّلِحينَ، أَشهَدُ أن لاَ اله إلاَّ أَللّه وأشهَدُ اَنَّ مُحمداً عَبدُهُ وَرَسُلُهُ)[6]. واته: سڵاوی پڕ فەڕو بەرەکەت بەرزی و بڵندی شایستەی خوای

---

(١) أخرجه الترمذي: (٢٦٢)، وأبوداود: (٨٧١).

(٢) أخرجه البخاري: (٢/٢٤٧)، ومسلم: (٤٨٤).

(٣) أخرجه مسلم: (٤٨٧)،وأبو داود: (٨٧٢).

(٤) أخرجه أبو داود: (٨٥٠)، والترمذي: (٢٨٥)، وصححه الألباني.

(٥) أخرجه أبو داود: (٨٧٤)، والنسائي: (٣/٢٢٦)، في الإرواء: (٣٣٥).

(٦) متفق عليه: البخاري: (٨٣٥)، و مسلم: (٤٠٢).

گەورەیە، سڵاوت لەسەر بێت ئەی پێغەمبەر لەگەڵ ڕەحمەت و میهرو بەرەکاتی خوایی‌دا، سڵاوی خوا لەسەر ئێمە و لەسەر هەموو بەندە چاك و ساڵحەکانی خوای گەورە، شایەتی دەدەم کە هیچ فریادڕەسێك نیە شایەنی پەرستن بێت جگە لەو خوایەی کە تاك و تەنیایە، هەروەها شایەتی دەدەم کە موحەممەد ﷺ فروستادەی خوایە و لە لایەن ئەوەوە ڕەوانە کراوە.

١١- پاشان سڵاوات دەدرێت لەسەر پێغەمبەر ﷺ بەم شێوەیە: (اللّٰهُمَّ صَلِّ علَى محمد و علَى آلِ محمد، كَما صَلَّيتَ علَى إبراهيمَ وعلَى آلِ إبراهيم، اللّٰهُمَّ بارك على محمد و على آل محمد، كَم بَارَكتَ على إبراهيم وعلى آل إبراهيم، إنَّكَ حَميدٌ مَجيدٌ)[١].

١٢- سڵاو دانەوە بەلای ڕاستدا: (السّلام عَلَيكُم وَرَحمَةُ اللّٰهِ وَ بَرَكاتُهُ)[٢].

١٣- یەك لەدوای یەك (الترتيب): پێغەمبەری خوا ﷺ بەو پیاوەی نوێژەکەی تەواو نەبوو فەرمووی: (ثُمَّ.. ثُمَّ..). واتە: پاشان..پاشان..

# سوننەتەکانی نوێژ :

سوننەتەکانی نوێژ: بریتین لەو گوفتار و کردارانەی کە چاکە بکرێن لە نوێژدا، خاوەنەکەی پاداشتیان لەسەر وەردەگرێت، بەڵام ئەگەر بەجێشی نەهێنان پێی گوناهبار نابێت، نوێژەکەی دروستە و بەتاڵ نابێتەوە.

١- دەست بەرزکردنەوە لە کاتی (اللّٰه اكبر)ی نوێژ دابەستندا تا نەرمایی گوێچکەکان، ناولەپ بەرەو رووگە بێت: عَنْ سَالِمٍ عَنْ أَبِيهِ قَالَ رَأَيْتُ رَسُولَ اللّٰهِ ﷺ: إِذَا افْتَتَحَ الصَّلاَةَ رَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى يُحَاذِىَ مَنْكِبَيْهِ)[٣].

٢- دانانی دەستی ڕاست لەسەر دەستی چەپ لە سەرووی ناوکەوە: (وَضَعَ ﷺ يَدَهُ الْيُمْنَى عَلَى الْيُسْرَى فِي الصَّلاةِ)[٤].

---

(١) أخرجه مسلم: (٤٠٦).

(٢) صحيح، جامع الترمذي: (٨٩/٢).

(٣) صحيح مسلم: (٨٨٧).

(٤) صحيح مسلم: (٩٣٢).

٣- خوێندنی ئەم زیکر و دوعایانە:عائشە ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ لەدوای نوێژ دابەستن ئەم دوعایانەی دەخوێند: ( سبحانك اللهم وبحمدك وتبارك اسمك وتعالى جدك ولا إله غيرك)[1]

*(وَجَّهْتُ وَجهيَ لِلذّي فَطَرَ السَّموات وَ الأرضَ حَنيفاً مُسليماً وَمَا أنا مِنْ المُشْرِكينَ، إنَّ الصَّلاتي وَنُسُكي وَمَحياىَ وَمماتِي لِلَّه رَبِّ العالَمينَ لاشَريكَ لَهُ وَبذلِكَ أُمِرتُ وَ أَنا مِنَ المُسلمينَ)[2].

* (اللَّهُمَّ بَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطَايَايَ كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ، اللَّهُمَّ نَقِّنِي مِنَ الْخَطَايَا كَمَا يُنَقَّى الثَّوْبُ الأَبْيَضُ مِنَ الدَّنَسِ، اللَّهُمَّ اغْسِلْ خَطَايَايَ بِالْمَاءِ وَالثَّلْجِ وَالْبَرَدِ)[3]. نوێژ خوێن دەتوانێت هەرجارەی یەکێك لەم دوعایانە بخوێنێت.

٤- وتنی: (أعُوذُ بِاللَّهِ مِنِ الشيطانِ الرجيمِ).

٥- وتنی: (آمین) لە دوای خوێندنی سورەتی فاتیحە.

٦- خوێندنی قورئان لە دوای سورەتی فاتیحە: لە رکاتی یەکەم و دووەمدا سونەتە بە یەکدەنگی زانایان.

٧- وتنی (الله اكبر) لە کاتی هەستان و دانیشتنی نوێژەکەدا.

٨- خوێندنی زیکر و دوعا لەدوای هەستانەوە لە رکوع: (ربَّنا و لكَ الحمد حَمداً كَثيراً طيباً مُباركاً فيه)[4]. کابرایەك ئەمەی وت، پێغەمبەر صلى الله علية وسلم فەرمووی: کێ ئەمەی وت کابرا وتی من، فەرمووی: بینیم سی و ئەوەندە مەلائیکە هەڵپەیان بۆ کرد بینوسن.

---

(١) صحيح سنن أبوداود: ١/٢٦٠برقم: ٧٧٦، وقال الألباني صحيح وانظر الإرواء: ٣٤١.

(٢) صحيح مسلم: (٧٧١).

(٣) صحيح البخاري (٧٤٤)، ومسلم (٥٩٨).

(٤) صحيح البخاري: (٢/٢٣٧)، وأبو داود: (٧٧٠).

* (ربنا ولك الحمد ملء السماوات وملء الأرض وملء ما بينهما وملء ما شئت من شيء بعد)[1].

**٩- له كاتی دانیشتنی تەحیاتی دووەمدا قاچی چەپ بۆ لای ڕاست لە ژێر قاچی ڕاستەوە دەردەکرێت، قاچی ڕاست دادەچەقێنرێت لەسەر پەنجەکان بەرەو رووگە، لای چەپیش دەخرێتە سەر زەوی.**

**١٠- پاڕانەوە لە دوای تەحیاتی دووەم:** (اللَّهُمَّ إنِي أعوذُ بِكَ مِن عذابِ وَمِن عذاب القَبرِ، و من فِتنةِ المَحيا و المَمات وَمن شر المَسيح الدَجّالِ)[2]. **پێغەمبەری خوا ﷺ هاوەڵانی فێری ئەم دوعایە دەکرد هەر وەك چۆن فێری سورەتێکی قورئانی دەکردن)**[3].

- (اللَّهُمَّ إنِي ظلَمتُ نَفسي ظلماً كَثيراً، و لايَغفِرُ الذنوبَ إلا أنتَ، فَاغفر لِي مَغفِرة من عِندِكَ، وارحمني إنَّكَ أَنتَ الغَفُورُ الرَّحيم)[4].
- (اللَّهُمَّ رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ).
- (اللَّهُمَّ أَعِنّي علَى ذِكرِكَ وَ شُكرِكِ وَ حُسنِ عِبادَتِكَ)[5].
- **پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم دوعایەی فێری عائشە کردووە:** (اللهم إني أسألك من الخير كله عاجله وآجله ما علمت منه وما لم أعلم وأعوذ بك من الشر كله عاجله وآجله ما علمت منه وما لم أعلم..)[6]. **هەروەها چەندەها زیکر و دوعای تریش کە سوننەتە بخوێنرێن لە نوێژدا..**

**١١- سڵاو دانەوە بە لای چەپدا:** (السلام عليكم و رحمة الله و بركاته).

---

(٥) صحيح، جامع الترمذي: (٢/٥٣).

(١) صحيح البخاري: (٣/١٩٢)، ومسلم: (٥٨٨).

(٢) رواه مسلم وأبو عوانة وأبو داود وأحمد بسند صحيح .

(٣) صحيح البخاري: (٢/٢٦٥)، ومسلم:(٢٧٠٥).

(٤) صحيح البخاري، أبوداود: (١٥٠٨) والنسائي: (٣/٥٣).

(٥) قال الشيخ الألباني صحيح في سنن إبن ماجة: ٢/١٢٦٤ برقم: ٣٧٤٦.

# زیکر و دوعاکانی دوای نوێژ:

سوننەتە بە نهێنی ئەم زیکر و دوعایانە لە پاش نوێژە فەرزەکان بخوێنرێن:

١- وتنی: (استغفر الله) سێ جار[١].

٢- وتنی: (اللّهمّ أنت السّلام و مَنك السّلام تَباركتَ يا ذاالجَلالِ و الإكرام)[٢].

٣- خوێندنی(آية الكرسي): ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُۚ لَا تَأۡخُذُهُۥ سِنَةٞ وَلَا نَوۡمٞۚ لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ مَن ذَا ٱلَّذِي يَشۡفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذۡنِهِۦۚ يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡۖ وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيۡءٖ مِّنۡ عِلۡمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَۚ وَسِعَ كُرۡسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَۖ وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفۡظُهُمَاۚ وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡعَظِيمُ ﴾ البقرة: ٢٥٥. هەرکەسێك لە دوای نوێژە فەرزەکان بیخوێنێ هیچ شتێ نابێتە رێگر لە نێوان ئەو و بەهەشتدا تەنها مردن نەبێ.

پێشەوا (طبرانى) خوێندنی: ﴿ قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴾ یشی بۆ زیاد کردووە[٣].

(آية الكرسي) گەورترین ئایەتە لە قورئاندا بە پێی ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ: (يَا أَبَا الْمُنْذِرِ أَتَدْرِى أَىُّ آيَةٍ مِنْ كِتَابِ اللَّهِ مَعَكَ أَعْظَمُ. قَالَ قُلْتُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: يَا أَبَا الْمُنْذِرِ أَتَدْرِى أَىُّ آيَةٍ مِنْ كِتَابِ اللَّهِ مَعَكَ أَعْظَمُ. قَالَ قُلْتُ اللَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْحَىُّ الْقَيُّومُ. قَالَ فَضَرَبَ فِى صَدْرِى وَقَالَ: وَاللَّهِ لِيَهْنِكَ الْعِلْمُ أَبَا الْمُنْذِرِ)[٤].

٤- خوێندنی ئەم سێ سورەتە:

﴿ قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴾، ﴿ قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ﴾، ﴿ قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ ﴾[٥].

---

(١) صحيح مسلم: (٥٩١).

(٢) صحيح مسلم: (٥٩١).

(٣) رواه النسائي: ١٠٠، وصححه الألباني في صحيح الجامع: ٥/٣٣٩.

(٤) صحيح مسلم: (١٩٢١).

(٥) رواه أبو داود: ١٥٣٢، وصححه الألباني في صحيح سنن أبي داود: ١/٢٨٤.

٥- وتنی (٣٣) جار: (سُبحان الله)، (٣٣) جار: (الحمد لله)، (٣٣) جار: (الله اكبر)، یەك جار: (لا إله إلا الله وحده لا شريك له. له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير).

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: هەر كەسێ لە پاش هەموو نوێژێك (٣٣) جار بڵێ: (سبحان الله)، (٣٣) جار بڵێ: (الحمد لله)، (٣٣) جاریش بڵێ: (الله اكبر). ئەوە دەكاتە نەوەد و نۆ، لە پاش ئەوانیش یەك جار بڵێ: (لا إله إلا الله وحده لا شريك له. له الملك وله الحمد وهو لى كل شيء قدير)، ئەوە كردیە سەد جار، خوای گەورە لە گوناهەكانی خۆش دەبێت با بەقەد كەفی دەریاش بن[1]

٦- خوێندنی: (لا إله إلا الله وحده لا شريك له له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير اللهم لا مانع لما أعطيت ولا معطي لما منعت ولا ينفع ذا الجد منك الجد)[2]

٧- خوێندنی دە جار: (لا إله إلا الله وحده لا شريك له. له الملك وله الحمد وهو لى كل شيء قدير) لەدوای نوێژی بەیانی و شێوان.

٨- خوێندنی: (اللهم إني أسألك علما نافعا ورزقا طيبا وعملا متقبلا)[3] لەدوای نوێژی بەیانی.

## ئەو شتانەی نوێژ بەتاڵ دەكەنەوە :

١- قسەكردن لە نوێژدا بەقەستی.

٢- قاقای پێكەنین، یان پێكەنینێ نوێژخوێنان گوێیان لێ بێ.

٣- خواردن و خواردنەوە بەقەستی.

٤- رووتكردنی هەندێ لەعەورەت.

٥- زۆر خۆلادان لەرووی رووگە بەبێ زەرورەت.

---

(١) رواه مسلم: (٥٩٧)

(٢) صحيح سنن النسائي: (٣/٧٠) برقم: ١٣٤١

(٣) صحيح سنن إبن ماجه: ١/١٥٢، برقم:٩٢٥.

٦- زۆر جوڵان و ئاوڕدانەوە بەم لاو لادا.

٧- نەمانی دەستنوێژ وەك دەرچوونی هەرشتێ لەپێش یان لەدواوە.

٨- زیادكردن یان كەمكردنی روكنێك یان مەرجێك لە نوێژ بەقەستی.

٩- پێشبڕكێ كردن لەگەڵ ئیمامدا.

# نوێژی سوننەت لەپێش و دوای فەرزەكان

**یەكەم: سوننەتی (المؤكدة):** ئەو نوێژە سوننەتانەن كە پێغەمبەری خوا ﷺ بەردەوام كردوونی ژمارەیان دە یان دوانزە ركاتە:

* عن ابن عمر (رضي الله عنهما) قال: (صليت مع رسول الله ﷺ عشر ركعات: ركعتين قبل الظهر. و ركعتين بعدها. و ركعتين بعد المغرب. و ركعتين بعد العشاء. و ركعتين قبل الصلاة الصبح)[1]. ئیبن عومەر (رەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ ئەم دە ڕكات نوێژەم كردووە: دوو ڕكات پێش نوێژی نیوەڕۆ و دوو ڕكاتیش لە دواوە، دوو ركات دوای نوێژی مەغریب، دوو ركات دوای نوێژی عیشا، دوو ڕكات پێش نوێژی بەیانی:

پێشەوا شافیعی و حەنبەلیەكان لەسەر ئەم رایەن، بەڵام لای حەنەفیەكان ژمارەیان دوانزە ركاتە، چونكە ئەوان چواری پێش نیوەڕۆ حساب دەكەن..

* عن أم حبيبة رضي الله عنها زوج النبي ﷺ أنها قالت: سمعت رسول الله ﷺ يقول: (ما من عبد مسلم يصلي لله كل يوم ثنتي عشرة ركعة تطوعا، غير فريضة، إلا بني الله له بيتا في الجنة)[2]. واتە: ئوم حەبیبە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بیستم لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر بەندەیەكی موسڵمان لە رۆژێكدا دوانزە ركات نوێژ بكات. بەمەرجێك لە نوێژە فەرزەكان نەبن ئەوا خوای گەورە لە بەهەشتداماڵێكی بۆ دروست دەكات.

---

(١) رواه مسلم: (٧٢٨)، والترمذي: (٤١٥)، وأبو داود: (١٢٥٠).

(٢) أخرجه مسلم: (٧٢٨)، والترمذي: (٤١٥) .

١- دوو ركات پێش نوێژی بەیانی: عائشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی دوو ركات سوننەتی پێش نوێژی بەیانی فەرموویەتی: (ركعتين عند طلوع الفجر لهما أحب إلي من الدنيا جميعا)[1]. واتە: خۆشەویسترە لە لای من لە هەموو دنیا.

* هەروەها عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی: ئەوەندە درێژەی نەدەدا بەو دوو ركاتە، وام دەزانی فاتیحەی نەخوێندووە.

* سوننەتە لە ركاتی یەکەمدا ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ﴾ بخوێنرێت، لە ركاتی دووەمیشدا ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ﴾[2].

٢- نوێژی نیوەڕۆ: سوننەتە دوو یان چوار ركات پێش نوێژی نیوەڕۆ بکرێت، دوو ركاتیش پاش نوێژ بە بەڵگەی ئەم فەرمودانە: واتە: ئوم حەبیبە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (من حافظ على أربع ركعاتٍ قبل الظهر وأربعٍ بعدها، حرم على النار)[3]. واتە: هەرکەسێك پارێزگاری بکات لە چوار ركات پێش نوێژی نیوەڕۆ و چوار ركاتی پاش نیوەڕۆ، خوای گەورە لە ئاگری دۆزەخ قەدەغەی دەکات.

* عن عبدالله بن شقيق. قال: سألت عائشة (رضي الله عنها) عن صلاة رسول الله ﷺ، عن تطوعه؟ فقالت: (كان يصلي في بيتي قبل الظهر أربعا. ثم يخرج بالناس. ثم يدخل فيصلي ركعتين)[4]. عەبدولڵای کوڕی شەقیق (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پرسیارم لە عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) کرد دەربارەی نوێژی سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش فەرمووی: لە ماڵی من چوار ركاتی پێش نوێژی نیوەڕۆی دەکرد، پاشان دەچوو لە مزگەوت پێش نوێژی دەکرد بۆ موسڵمانان، کە دەهاتەوە بۆ ماڵەوە دوو ركاتی تر نوێژی دەکرد.

---

(١) رواه مسلم: (٧٢٥)، والترمذي: (٤١٦).

(٢) رواه مسلم: (٧٢٦).

(٣) رواه أبو داود: (١٢٦٩)، وقال الألباني صحيح في جامع الترمذي: ٢/٢٩٢، برقم: (٤٢٨).

(٤) أخرجه مسلم: (٧٣٠)، و أحمد: (٦/ ٣٠).

٣- دوو ركات پاش نوێژی شێوان: ئیبن مەسعود (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ﴾ و﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴾ی خوێند لە پاش نوێژی شێوان[1].

٤- دوو ركات پاش نوێژی خەوتنان.

**دووەم: سوننەتی (غَير المؤكدة):** ئەو نوێژە سوننەتانە دەگرێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە بەردەوامی نەیکردوون.

١- دوو ركاتی پاش دوو ركاتە (المؤكدة)کەی پاش نوێژی نیوەڕۆ.

٢- دوو ركات پێش نوێژی عەسر.

٣- دوو ركات پێش نوێژی شێوان.

٤- دوو ركات پێش نوێژی خەوتنان.

٥- دوو ركات لە نێوان هەموو بانگ و قامەتێكدا: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (بَيْنَ كُلِّ أَذَانَيْنِ صَلَاةٌ بَيْنَ كُلِّ أَذَانَيْنِ صَلَاةٌ ثُمَّ قَالَ فِي الثَّالِثَةِ لِمَنْ شَاءَ)[2] واتە: لە نێوان هەموو بانگ و قامەتێكدا دوو ركات نوێژ هەیە، لە نێوان هەموو بانگ و قامەتێكدا دوو ركات نوێژ هەیە سێیەم جار فەرمووی: بۆ کەسێك بیەوێت.

| نوێژە فەرزەکان | سونەتەکانی پێش نوێژ | فەرزەکان | سونەتەکانی دوای نوێژ |
|---|---|---|---|
| بەیانی | ٢ | ٢ | ٠ |
| نیوەڕۆ | ٢ ، ٢ | ٤ | ٢ |
| عەسر | ٢ ، ٢ | ٤ | ٠ |
| شێوان(مەغریب) | ٢ | ٣ | ٢ |
| خەوتنان(عیشا) | ٢ | ٤ | ٢ ، ٣ وتر |
| جومعە | ٢ نوێژی چوونە مزگەوت | ٢ | ٢ لە ماڵەوە<br>یا ٢،٢ لە مزگەوت |

(١) رواه الترمذي: (٤٣١)، و النسائي. وأحمد: (٤٥٣٣).

(٢) أخرجه البخاري: (٦٢٤)، و مسلم (٨٣٧).

# فەزڵی نوێژە سونن‌ەتەکان لەماڵەوە

نوێژە سوننەتەکانی پێش نوێژ و دوای نوێژە فەرزەکان فەزڵ و خێری گەورەیان هەیە بەتایبەتی ئەگەر لە ماڵەوە بکرێن، چونکە دەبنە هۆی پڕکردنەوەی کەم و کوڕی نوێژە فەرزەکان و بەدوور بوون لە ریایی و رووپامایی، منداڵان چاو لە ئاکار و ڕەوشتی باوك و دایکیان دەکەن و رادێن لەسەر نوێژکردن، هەروەها خێر و بەرەکەتیشە بۆ ناوماڵ و ماڵەکان نابن بەگۆڕستان نوێژیان تێدا نەکرێت.

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (أن أول ما يحاسب به العبد يوم القيامة من عمله صلاته فإن صلحت فقد أفلح وأنجح وإن فسدت فقد خاب وخسر فإن انتقص من فريضته شيء قال الرب عز وجل انظروا هل لعبدي من تطوع فيكمل بها ما انتقص من الفريضة ثم يكون سائر عمله على ذلك)[1]. واتە: یەکەم کردەوە موحاسەبەی بەندەی لەسەر دەکرێ لە قیامەتدا نوێژە، جا ئەگەر چاك و تەواو بوون ئەوا سەرکەوتوو و سەرفرازە، ئەگەر ناتەواو بوون ئەوە دۆڕاو و پەشیمانە، ئەگەر نوێژە فەرزەکانی کەم و کووڕی هەبوو ئەوا پەروەردگار دەفەرموێت: سەیرکەن بزانن بەندەکەم چەندە نوێژی سوننەتی هەیە با فەرزەکانی پێ تەواو بکەین و کەم و کووڕییەکانی پێ پڕبکەینەوە، هەروەها هەموو کردەوەکانی تریشی بەو شێوەیە دەبێت.

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (إذا قَضَى أَحَدُكُم الصلاةَ في مَسجدِهِ فَلْيَجعَل نَصيباً مِنْ صَلاتِه، فَإنَّ اللهَ جَاعِلٌ في بيتِهِ مِنْ صَلاتِهِ خيراً)[2].

واتە: کاتێك نوێژە فەرزەکانتان لە مزگەوت تەواو کرد، بەشی ماڵەوە بهێڵنەوە لە نوێژە سوننەتەکان، خوای گەورە پاداشتێکی زۆرتان دەداتەوە لەسەر ئەو نوێژە سوننەتانەی لە ماڵەوە ئەنجامی دەدەن.

---

(١) صحيح جامع الترمذي: ٢/٢٦٩ برقم: ٤١٣، الألباني في الصحيحة: (١٣٥٨).

(٢) أخرجه مسلم: (٧٧٨).

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: (مَنْ صَلّى صَلاةً لَمْ يَتِمها، زَيّدَ عَلَها مِن سُبحانه حتى تَتم). واتە: هەر موسوڵمانێ نوێژێك بكات بە تەواوی ئەنجامی نەدات، ئەوا لەو سوننەت و تەسبیحاتانەی کە کردوویەتی بۆی تەواو دەکرێت.[1]

* هەروەها فەرموویەتی: (صَلّوا أَيُّها الناس فى بُيُوتِكُم، فإنَّ أَفضَلُ الصَّلاةَ صلاةُ المَرء فى بَيته إلاّ المَكتُوبَة)[2] واتە: ئەی خەڵكینە نوێژ بكەن لە ماڵەكانتاندا، چونكە خێرترین نوێژ نوێژی كەسێكە لە ماڵەوە بیكات جگە لە نوێژە فەرزەكان.

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: (فَضْلَ الصَّلاة الرَّجُل فى بيته على صلاته - حيثُ يراه الناس - كَفَضل الفريضَة على التَطَوّع)[3] واتە: خێری نوێژی پیاوێ لە ماڵەوە بیكات بەسەر ئەو نوێژەی - خەڵك دەیبینێ - وەك خێر و گەورەیی نوێژە فەرزەكانە بەسەر سوننەتەكاندا.

* هەروەها دەفەرمووێت: (صَلاةُ المَرْء فى بَيته، أَفْضَلُ مِن صَلاته فى مَسْجدي هَذا إلاّ المَكتُوبَة)[4] واتە: خێر و گەورەیی نوێژی كەسێ لە ماڵەوە باشترە لەو نوێژەی لەم مزگەوتەی مندا بیكات جگە لە نوێژە فەرزەكان.

*ئیبن عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا فەرمویەتی: (صَلُّوا فِي بُيُوتِكُمْ وَلاَ تَتَّخذُوهَا قُبُورًا)[5] واتە: نوێژ بكەن لە ماڵەوە ماڵەكانتان مەكەن بە گۆڕستان.

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: وێنەی ئەو ماڵەی یادی خوای تێدا دەكرێت و، ئەوەی تێیدا ناكرێت وەك زیندوو و مردوو جیاوازن[6]

---

(١) أخرجه الطبراني في الكبير، وانظر الصحيحة: (٢٣٥٠).

(٢) أخرجه مسلم: (٧٨١) و البخاري (٧٣١).

(٣) أخرجه البيهقي ، صحيح الترغيب و الترهيب: (٤٤١).

(٤) أخرجه ابوداود (صحيح سنن ابوداود) (٩٢٢) و غيره.

(٥) صحيح مسلم: (١٨٥٧)، و الترمذي: (٢٨٧٧).

(٦) رواه البخاري ومسلم ،وصححه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب: (٤٣٨).

# پێویستییەکانی نوێژ

گەورەترین و باشترین کارێك کە ئیمانی پێ زیاد بێت نوێژە وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَـٰنَكُمْۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ البقرة: ١٤٣.
پێشەوا بوخاری (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە ڕاڤەی ئەم ئایەتەدا دەڵێت: خوای گەورە ئیمان و باوەڕی ئەوانەتان زایە ناکات کە ڕوو بە قیبلەی پێشوو نوێژیان کردووە کە (بیت المقدس)ە[1].

ئیمان بریتییە لە گوفتار و لەکردار بە زمان دەوترێت و کردەوە دەیسەلمێنێ، زیاد دەکات و کەم دەکات، بێگومان نوێژ هەردووکیانە.

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموویێت: (آمُرُكم بأَرْبَعٍ، وَأَنْهاكمُ عَنْ أَرْبَعٍ آمُرُكم بالإِيمَان باللَّه وَحْدَهُ، أَتَدْرُن مَاالأيمَان باللَّه وَحْدَه ؟ شَهَادَةَ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلا اللَّه، وَأَنَّ مُحَمَداً رَسُولُ اللَّه، وَإِقام الصَّلاَة، وَإِيتَاء الزَّكاة، وَصيام رمضان..)[2].

واتە: فەرمانتان پێ دەکەم بە چوار شت، چواریشتان لێ قەدەغە دەکەم، فەرمانتان پێ دەکەم بە ئیمان هێنان بە خوای تاك و تەنیا، ئایا دەزانن ئیمان بەخوای تاك و تەنیا چییە؟ شایەتی بدەن کە هیچ خوایەك نیە جگە لە زاتی (الله) و موحەمەدیش پێغەمبەری خوایە و لەلایەن ئەوەوە ڕەوانە کراوە، نوێژ بکەن، زەکات بدەن، ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بگرن..

پێویستە لەسەر موسڵمانان زۆر زۆر گرنگی و بایەخ بدەن بە نوێژەکانیان بە چەند کارێك لەوانە:

**یەکەم: نوێژەکانیان وەك نوێژەکانی پێغەمبەر ﷺ ئەنجام بدەن:**

بێگومان هەر خواپەرستی و عیبادەتێك کە ئەنجامی دەدەن پێویستە بە بەڵگەی قورئان و سوننەت بێ ئیتر هەمەکی بێ یا هەندەکی، چونکە ئەوە بەرنامەی ڕاست و دروستە، جگە لەوەش گومڕایی و سەرگەردانیە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ

---

(١) فتح الباري شرح صحيح البخاري لابن حجر العسقلاني.

(٢) أخرجه البخاري (٤٣٦٨)، و مسلم (١٧).

﴿وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟﴾ الحشر: ٧. واته: هەرچی پەیامبەر پێیدان وەری بگرن، واته: بەچی فەرمانی پێکردن بیکەن، رێیشی لەهەر شتێك لێگرتن و لێی قەدەغەکردن، ئێوەش دەستی لێ هەلگرن و مەیکەن.

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (مَن أحدَثَ في أمْرِنا هذا مَا لَيسَ مِنهُ فَهُوَ رَدٌّ)[1]. واته: هەر کەسێك شتێك لەم ئاینەو شەرعەی ئێمە زیاد بکات، ئەوە لێی قبولْ ناکرێ و دەدرێتە دواوە.

* هەروەها دەفەرموێت: (مَن عَمِلَ عَمَلاً لَيْسَ عَلَيهِ أمْرُنا فَهُوَ رَدٌّ)[2]. واته: هەر کەسێك هەر کارو کردەوەیەك بکات کە فەرمان و رەزامەندی ئێمەی لەسەر نەبێت و بە پێی شەرع نەبێت ئەوە لێی قبولْ ناکرێت و دەدرێتە دواوە. ئەمەش هەموو بوارەکانی عیبادەت و کڕین و فرۆشتن دەگرێتەوە.

لە قورئان و سوننەتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو شتێك ئاشکرا و روون کراوەتەوە، هیچ شتێکیان بە نهێنی و شاراوەیی نەهێشتووەتەوە، بەدوور و درێژی باسی بەندایەتی کراوە، شەوی تاریکیان وەك رۆژی رووناك بۆ لێکردووین، ئەوەندە بە جوانی فەرمان و ئەحکامەکانیان بۆ بەیان کردووین..

پێغەمبەری خوا ﷺ مامۆستاو سەر مەشقە بۆمان لە هەموو کاروبارێکدا چ جای لە پەرستشەکاندا.. بۆیە پێویستە هەنگاو بە هەنگاو شوێن پێی هەلگرین: (صلوا كما رأيتموني أصلي)[3]. واته: نوێژ بکەن بەو شێوەیەی کە من دەبینن دەیکەم.

ئەمەش بە پێداچوونەوەی کتێبە شەرعی و زانستییەکانی فیقه و فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەبێ، بە فێربوون و خوێندنیان لەلای زانا و مەلا بەرێزەکان و لەسەر چۆك دانیشتن لەبەردەمیاندا بە ئەدەبەوە دەبێ، بێگومان دلْ رووناك دەبێتەوە بە سەیرکردنی ئەوانە.

---

(١) أخرجه البخاري: (٢٦٩٧)، ومسلم: (٤٤٦٨) (١٦٧/٣).

(٢) جامع الصحيح : (١٣٤٤/٣)، ومسلم: (١٧١٨).

(٣) رواه البخاري: (٦٣١).

کاتێك بەندەی خوا نوێژ دەکات دەبێت مەرج و روکن و واجبەکان بزانێ و جێبەجێیان بکات، وا هەست بکات لەسەر بەرنامەی پێغەمبەری خوایە ﷺ، پابەندبێ بەوەی پێوەی پابەند بووە، واز لەوە بهێنێ نەیکردووە و وازی لێ هێناوە، هەندێ جار ئەو شتانە بکات کە هەندێ جار کردوونی.. پێغەمبەری خوا ﷺ هەرکاتە و هەر شوێنە زیکر و یادی تایبەتی خۆی تێدا کردووە، بۆ نمونە زیکر و یادەکانی ئێواران و بەیانیان..

ئەگەر ئادەمیزاد هەستیکرد شوێن پێی پێغەمبەری خوای ﷺ هەڵگرتووە، لە شوێنکەوتنی ئەوەوە هەست بە شیرینی ئیمان دەکات، چ شتێك لە شوێنکەوتنی بەرنامەی خوا و پێغەمبەر چاکتر و گەورەترە؟. جگە لە شوێنکەوتنی ئەو بەرنامەیە هەمووی سەرگەردانی و ماڵ وێرانییە، دوای سەراب کەوتنە، تەنها رێگا و بەرنامەکەی ئەو راستە چونکە مایەی بەختەوەری دنیاو قیامەتە.

* ئەبو ئەییوب (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: (مَنْ تَوضَأَ كَما أُمِرَ، وصَلى كَما أُمِر، غُفِرَ لَهُ مَاقَدَّمَ مِنْ عَمَلٍ)[1]. واتە: هەرکەسێ دەستنوێژ بگرێت وەك چۆن فەرمانی پێکراوە و، نوێژ بکات بەو شێوەیەی فەرمانی پێکراوە، خوای گەورە لە کردەوە خراپەکانی رابردووی خۆش دەبێ.

* عەمماری کوڕی یاسر (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (إِنَّ الرَجُلَ لَيَنْصَرِفُ، وَ مَاكُتِبَ إلا عُشرُ صَلاتِه، تُسْعُها، ثُمْنُها، سُبْعُها، سُدْسُها، خُمْسُها، رُبْعُها، ثُلْثُها، نِصْفُها)[2]. واتە: نوێژخوێن کاتێك لە نوێژەکەی بوویەوە، بەپێی خشوع و گەردن کەچییەکەی پاداشتی بۆ دەنوسرێت: جا یان دەیەکی نوێژەکەی بۆ دەنوسرێت، یان نۆ یەکی، هەشت یەکی، حەوت یەکی، شەش یەکی، پێنج یەکی، چوار یەکی، سێیەکی، یان نیوەی بۆ دەنوسرێت.

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (مِنْكُم مَن يُصَلِي الصَلاةَ كامِلَةً، وَمِنْكُم مَنْ يُصَلي النِصْفَ، والثُلَثَ، والخُمْسَ، حتَى بَلَغَ العُشْرَ)[3]. واتە: هی واتان هەیە نوێژەکەی بە

---

(١) رواه النسائي وابن ماجه وقال الالباني حسن صحيح في صحيح الترغيب و الترهيب:(١٩٦).

(٢) رواه أبوداود والنسائي وابن حبان والألباني في صحيح الترغيب والترهيب: (٥٣٧).

(٣) رواه النسائي بإسناد حسن والألباني في (صحيح الترغيب و الترهيب) (٥٣٧).

تەواوی دەکات، هی واشتان هەیە نیوەی، یان سێیەکی، چوار یەکی، پێنج یەکی تا دە یەکی.

**دووەم: پارێزگاری لە خشوع:** ئیبن رەجەبی حەنبەلی (رەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: خشوع واتە زەلیلی نواندن لە بەردەم پەروەردگاری باڵا دەست و خاوەن دەسەڵاتی رەهادا.

ئیبن قەیم (رەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: نوێژ بەبێ خشوع وەك جەستەی بێ گیان وایە، دەی لەوە شوورەیی تر دەبێ چی بێت پیاو جەستەیەکی بێ گیان بە دیاری بەرێت بۆ خاوەن دەسەلاتێکی دنیایی، چ جای بۆ خوای گەورە؟!.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَدۡ أَفۡلَحَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ۝١ ٱلَّذِينَ هُمۡ فِي صَلَاتِهِمۡ خَٰشِعُونَ﴾ المؤمنون: ١ - ٢. واتە: بەڕاستی سەرفراز و سەرکەوتوون ئەو ئیماندارانەی کە لە نوێژەکانیاندا دڵیان بەستراوە بە خوای خۆیانەوە و بەخشوعەوە نوێژەکانیان دەکەن.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلۡوُسۡطَىٰ وَقُومُواْ لِلَّهِ قَٰنِتِينَ﴾ البقرة: ٢٣٨. (إبن كثير) (بەرەحمەت بێ) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێ: بەخشوع و گەردن کەچییەوە نوێژەکانتان ئەنجام بدەن، بە ملکەچی و زەلیلیەوە بەندایەتی خودا بکەن و پەرستشەکانی بەجێ بێنن.

* لە ئەبو هوریرەوە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: رۆژێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی کرد و پاش سلاودانەوە فەرمووی: (يا فُلان ألا تُحْسِنُ صلاتُكَ ؟ ألاَ يَنْظُر المُصلي كَيْفَ يُصلِّي ؟ فإنَّما يُصلِّي لِنَفسِهِ)[1]. واتە: فلانە کەس! ئەوە نازانی نوێژەکەت بە خشوع و رێك و پێکی بکەیت؟ یان نوێژخوێن نابێ سەرنج بدات کاتێك نوێژ دەکات چۆن دەیکات؟ بەڕاستی ئەو نوێژە بۆخۆی دەکات.

ئەمانەش چەند هۆیەکارێکی گرنگ و پڕ بایەخن بۆ بوونی خشوع جا هەندێکیان لە ناو نوێژدان و هەندێکیشیان لە دەرەوەی نوێژ:

---

(١) أخرجه مسلم: (٤٢٣).

١- یادی مردن: یەکێك لەو شتانەی کە دەبێتە هۆی خشوع لە نوێژدا یادی مردنە، چونکە یادی مردن ترس دەخاتە دڵەوە، قیامەت بیردەخاتەوە، خشوع زیاد دەکات، هەروەها دەبێتە هۆی رێك و پێکی و تەواوی نوێژ و گەردنکەچی زیاتر.

* ئەنەسی کوری مالیك (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (أُذكُر المَوْت في صَلاَتكَ فإنَّ الرَجُلَ إذا ذَكَرَ المَوْتَ فِي صَلاتِه، لَحَرِيٌّ أنْ يُحْسِنَ صَلاَتَهُ، وَصَلِّ صَلاة رَجُلٍ لاَيَظُنُّ أنَّهُ يُصَلِّي صَلاةً غَيرَهَا)[١]. واتە: یادی مردن بکە لە نوێژدا، بێگومان کاتێك پیاو لە نوێژدا یادی مردنی کرد ئەوە شایەنی ئەوەیە نوێژەکەی جوان ئەنجام بدات، نوێژ بکەن وەك ئەو پیاوەی کە نوێژەکەی وا دەکات کە ئەوە دواهەمین نوێژیەتی و ئیتر نوێژی تر ناکات ئەوەندە بەخشوعەوە دەیکات.

بەڵێ دەبێ لە نوێژدا یادی مردن بکەین، چونکە مردن کۆتایی بە کردەوەکان دێنێ، پێویستە خۆمان ئامادەبکەین بۆ مردن و یادی بکەین، چونکە کەس لە دەستی قوتار نابێ، قوڕ بەسەرمان بۆ ئازارە سەختەکانی ناو گۆڕ، هانا بۆ لای کێ بەرین جگە لە خوای بەرەحم و بەبەزەیی؟، وەڵامان چییە لە گۆڕەکەدا کاتێ پرسیاریان لێ کردین؟ نازانین سەرەنجامان بەرەوکوێیە؟ بەرەو بەهەشتی بەرینە؟ یان بۆ ئەو جەهەنەمەیە کە سووتەمەنیەکەی ئادەمیزادە و بەردە؟ بەو شێوەیە ئادەمیزاد دەبێ بیر لە مردن و رووداوەکانی دوای مردن بکاتەوە، نوێژەکەی وا بکات کە دوا نوێژیەتی، بەخشوعەوە ئەنجامی بدات، تەوبەیەکی راستەقینە بکات، کفن بۆ خۆی ئامادە بکات، وەسیەت بکات و بینووسێ، حەقی کێی لایە بیداتەوە، کە بەیانی هات چاوەڕێی ئێوارە نەکات، ئێوارەش هات چاوەڕێی بەیانی نەکات، چونکە مردن لەپڕ یەخەی پێ دەگرێ و دەرچوون نیە لە دەستی، ئەگەر موسڵمان بەو شێوەیە بوو ئیتر ئەو کاتە دەتوانێ نوێژەکەی بەخشوع و گریانەوە ئەنجام بدات.

کاتێك نوێژخوێن دەڵێت: (اللّٰه اكبر) خوا لە هەموو شتێك بە گەورەتر دەزانێ و گەورەیی هەر بۆ خوایە، دنیای لە بەرچاو بچوك دەبێتەوە، پاشان ئەم دوعایە دەخوێنێ: (أَللّٰهُمَ بِاعِّد بَيْني وَبَيْنَ خَطَايَايَ كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِب، أَللّٰهُم نَقِّني مِن الذُنُوب

---

(١) أخرجه ديلمي وحسنه الألباني في صحيحه: (١٤٢١)، وحسنه حافظ إبن الحجر.

كَمَا يُنَقِّي الثَّوْبُ الأَبْيَضُ مِنَ الدَنَسِ، أَللّهُمَّ أغْسِلْنِي مِن خطاياي بالماء وَالبرد والثلج)[1]. واته: خوايه نێوان من و گوناهەكانم دوورخەرەوە وەك چۆن خۆرهەڵات و خۆرئاوات لەیەك دوورخستووەتەوە، خوایە پاكم بكەرەوە لە گوناهو تاوان وەك چۆن كراسی سپی لە چڵك و پیسی پاك دەبێتەوە، خوایە گوناه و تاوانەكانم بشۆرەوە بەئاو و بەفر و باران.

كۆڵی گوناهەكانی خۆی دێنێتە بەرچاوی خۆی، دەترسێ لەوەی خوای گەورە فڕێی بداتە ناو ئاگری دۆزەخەوە بە هۆی ئەو گوناهانەوە، دەترسێ پێش تەوبەكردن ژیانی كۆتایی بێت، ئیتر ئەو دوعایە لە نوێژدا دەخوێنێ. بیر لە مانای یەك بەیەكی وشەكانی نوێژ دەكاتەوە، خوا بەگەورە دەگرێ و ترسی خوا دەچێتە دڵیەوە، دەست دەكات بە گریان و فرمێسك رژاندن، چونكە بەهەشت و دۆزەخ لێی نزیك بوونەتەوە، ئیتر نوێژەكەی وا دەكات كە ئیتر ئەوە دوا نوێژە و خوای گەورە دەبینێت خۆ ئەگەر ئەویش توانای بینینی خوای خۆی نیە ئەوا خوای گەورە ئەو دەبینێ و ئاگاداری هەموو كردەوەیەكی نهێنی و ئاشكرایەتی: (صَلِّ صَلاَةَ مُودع كَأَنَّكَ تَراهُ، فإِنَ كُنْتَ لاتراهُ فإِنَّهُ يَراكَ)[2]. دەبێ نوێژ وا بكرێت خوای گەورە بكرێتە چاودێر بەسەریەوە، بۆ ئەوەی راست و دروست و وەرگیراو بێت، پشت بكرێتە دونیا، ئەگەر یەكێ بزانێ وتەكانی بیستراون و خوای باڵادەست ئاگای لێیەتی، ئەوكاتە دەڵێ چی؟ چۆن قسە دەكات؟ ئایا وتە و كردەوەكانی ناكێشرێن و پاداشت و تۆڵەیان لەسەر وەرناگرێ؟.

چۆنە حاڵی ئەو كەسەی رادەوەستێنرێت بۆ دادگایی لەبەردەم خوای بینەر و بیسەر و دانا و زانادا كە هیچ شتێكی لاشاراوە نیە، بەبێ تەرجومان.

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (إِنَّ أَوَّلَ مايُحَاسَبُ بِهِ الْعَبْدُ يَوْمَ القِيامَةِ الصَّلاة، فَإِنْ صَلُحَت، صَلَح لَهُ سَائِرُعَمَلِه، وَإِنْ فسَدَتْ فَسَد سائِرَ عَمَلِهِ)[3]. واته: یەكەم شتێ بەندە لە قیامەتدا موحاسەبەی دەكەن لەسەری نوێژە، ئەگەر نوێژەكانی پەسەند و تەواو بوون، ئەوا كردەوەكانی تریشی چاك و تەواو دەبن و سەركەوتوو دەبێت، ئەگەر خراپ

(١) رواه البخاري: (٧٤٤)، ومسلم: (٥٩٨).

(٢) أخرجه الطبراني في الاوسط والبيهقي والألباني في الصحيحة: (١٩١٤).

(٣) رواه الترمذي في الصلاة: (٤١٣)، وأبو داود: (٨٦٤)، والألباني في صحيحه:(١٣٥٨).

ئەنجامی دابوون و تەواو نەبوون ئەوا کردەوەکانی تریشی ناتەواو دەبن، ئەو کاتە دۆڕاو و پەشیمانە و سەرەنجامی دۆزەخە.

* عەبدوڵای کوڕی شیخیر (ڕەزای خوای لێ بێ) دەیفەرموو: پێغەمبەری خوامﷺ بینی پێش نوێژی بۆ دەکردین، دەنگێ لە سنگییەوە دەهات وەك قوڵپەی مەنجەڵ کاتێك دێتە کوڵ ئاوەها بوو لەتاو گریان)[1].

ئەبوبەکری صدیق (ڕەزای خوای لێ بێ) کەس لە قورئان خوێندنەکەی تێ نەدەگەیشت لەتاو گریانی لە نوێژدا!.

* پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوا ساتەکانی ژیانیدا کە نەخۆشی زۆری بۆ هێنا بوو. فەرمووی: بڕۆن بڵێن بە ئەبوبەکر بابێت پێش نوێژی بۆ ئەو خەڵکە بکات. عائیشە فەرمووی: ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەگەر بچێتە شوێنی تۆ پێش نوێژی بکات لە تاو گریانی کەس لێی تێناگات، با بڕۆن بە عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لێ بێ) بڵێن بێت پێش نوێژییان بۆ بکات، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ سووربوو لەسەر ئەوە کە دەبێت هەر ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێ بێ) پێش نوێژییان بۆ بکات[2].

* لە ریوایەتێکی تردا هاتووە: عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەبوبەکر پیاوێکی دڵ نەرمە زوو دەست دەکات بە گریان ئەگەر بچێتە جێگاکەی تۆ ناتوانێ پێش نوێژی بکات)[3].

عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لێ بێ) دەنگی گریانی دەبیسترا لە ڕیزەکانی دواوەی نوێژی جەماعەتدا، کاتێك ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە: ﴿إِنَّمَآ أَشۡكُواْ بَثِّي وَحُزۡنِيٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾ یوسف: ٨٦. واتە: یەعقوب بە کوڕەکانی خۆی فەرموو: بەڕاستی من شکاتی ئازار و خەم و پەژارە و ئاهی خۆم تەنها لای خوا دەکەم، نەك لای ئێوە..

---

(١) أخرجه أبوداود و النسائي و صححه الألباني في مختصر شمائل المحمديه:(٢٧٦).

(٢) أخرجه البخاري: (٧١٦)، ومسلم: (٤١٨).

(٣) أخرجه البخاري: (٦٦٤)، ومسلم: (٤١٨).

٢- لێکدانەوەی مانای وتەکانی نوێژ: کاتێك (اللّٰه أکبر)ی نوێژ دابەستن دەوترێت، ئیتر دەبێ مانای وشەکانی نوێژ ئامادەبکرێت و لێك بدرێنەوە و بیریان لێ بکرێتەوە، کاتێك دەوترێت [أعوذ باللّٰه مِن الشیطان الرجیم] دەبێ بیرلە ماناکەی بکرێتەوە واتە پەناگرتن بەخوا لە شەیتانی نەفرەت لێکراو، پەناگرتن و هانا بردنەبەر ئەو خوایەی کە بیسەرە و وتەی بەندەکەی دەبیستێ، زانایە و زانیاری تەواوی هەیە بە وەسوەسەی شەیتانەکان.

هەر بەو شێوەیەش بیردەکاتەوە لە مانای (بِسْمِ اللّٰه الرَّحْمنِ الرَّحیم) و(سبحان اللّٰه) و سلاواتدان.. بۆ ئەوەی نوێژخوێن بزانێ دەڵێ چی و داوای چی دەکات، پێویستە بە بیر و هۆشەوە نوێژەکەی بکات، بە گوێرەی توانا و وزەی خۆی عەقڵی بخاتە گەڕ.

٣- وازهێنان لە خراپە و تاوان: بێگومان هەموو قەومێك خوای گەورە بەپێی کردەوەی خۆیان مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات، نیعمەت و بەخششی خۆی لەسەر هیچ گەلێك هەڵناگرێت، تا ئەو گەلە خۆیان ڕەوشتی خۆیان لە چاکەوە نەگۆڕن بۆ بەدخویی و خراپە:

﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا۟ مَا بِأَنفُسِهِمْ﴾الرعد: ١١.

بەڵێ دەبێ لە خۆمانەوە دەست پێ بکەین خۆمان بگۆڕین و هەنگاو هەڵگرین بەرەو چاکەکاری، تا خوای گەورە بە ڕەحم و بەزەیی خۆی ڕەحممان پێ بکا و، بمانپارێزێ لەو هەموو بەڵا و ناسۆر و جەنگ و کاولکاری و بەرەڵاییەی سەردەمی بەناو پێشکەوتن و سیستمی نوێی جیهانی.

* ژن و هاوسەری خراپ و سەروەت و سامان خستنە بەردەستی نەفام دەبنە بەربەستی خشوع لە نوێژدا، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (ثَلاثَة يَدْعُون فَلايستجابُ لَهُم، رَجُل كانَت تَحتَهُ إمْرَأة سَيِّئَة الخُلق فَلَمْ يُطلِّقها، وَرَجُلٌ كان لَهُ على رَجُلٍ مَال فَلَم يُشهِدْ عَلَيْه، وَرَجُلٌ أتى سَفِهاً مَالَه وَقَدْ قَالَ اللّه تَعالى:﴿وَلَا تُؤْتُوا۟ ٱلسُّفَهَآءَ أَمْوَٰلَكُمُ﴾ النساء: ٥.واتە: سێ کەس دەپاڕێنەوە لە خوا بەڵام نزا و پاڕانەوەکانیان لێ وەرناگرێ، پیاوێ ژنێکی خراپ و بەدڕەوشتی هەبێ تەڵاقی نەدات، یان پیاوێ پارەی لای یەکێ بێ و شاهیدی نەبێ و ئەویش نەیداتەوە، یان پیاوێ سەروەت و سامانەکەی بەدەست کەسێکی بێ عەقڵ و نەفامەوە بێ. خوای گەورە دەفەرموێت: پارەو سامانی خۆتان مەخەنە بەردەستی کەسێك

کە هۆشی ساغ نەبێ و کەم عەقڵ بێ، چونکە هەمووی بێ هوودە خەرج دەکات .

* هەروەها دەفەرموێت: (إثنان لاتَجَاوَز صَّلاتُهما رءوسَهُمَا: عَبْدٌ أبقٌ مِن مَواليه حتى يَرجعَ إليهم، وَامْرأة عَصَتْ زَوْجَها حَتّى تُرجِع)[1] . واتە: دووکەس نوێژەکانیان لە تەوقە سەریان تێپەڕ ناکات: بەندەیەکی هەڵاتوو لە خاوەنەکەی تا نەگەڕێتەوە ژێر رکێفی، ژنێك نافەرمانی مێردەکەی بکا تا نەگەڕێتەوە ژێر فەرمانی مێردەکەی.

زۆر ئەنجامدانی بەندایەتی و گوێرایەڵی کردنی فەرمانەکانی خوا و پێغەمبەر ﷺ خشوع زیاد دەکەن و دەبنە هۆی چاکی و تەواوی نوێژ وەك: دەستگیرۆیی و بەزەیی هاتنەوە بە هەتیودا.

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (إن أرَدتَ تلِين قَلْبُك، فأَطعِم المِسْكيْن، وَمْسَح رأس اليَتمْ)[2]. واتە: ئەگەر دەتەوێ دڵت نەرم ببێ ئەوا خواردن بدە بەهەژاران و تێریان بکە، دەست بهێنە بەسەری هەتیواندا.

٤- دورکەوتنەوە لە زۆر پێکەنین: پێکەنینی زۆر دەبێتە هۆی مردنی دڵ و نەمانی خشوع لە نوێژدا وەك لەم فەرموودەیەدا ئاماژەی پێکراوە: (.. لا تُكثِر الضحكَ، فإنَّ كَثرَةَ الضَّحكِ تَميتُ القَلب)[3].

٥- هەڵبژاردنی کارێکی گونجاو: کارێکی گران و قورس نەبێ ببێتە هۆی دواخستنی نوێژەکان، چونکە ئەگەر ئیش قورس بوو زیهن بەربڵاو دەبێت و لەسەر خشوعی نوێژەکە دەکەوێت..

ئەگەر نوێژەکان لەکاتی خۆیاندا نەکران وردە وردە دەبنە هۆی سستی و تەمەڵی و فەوتانیان.

(١) أخرجه للطبراني في الصغير والاوسط وحسنه الألباني في الصحيحة: (٢٨٨).

(٢) أخرجه أحمد و غيره، والألباني في الصحيحة: (٨٥٤).

(٣) أخرجه احمد و الترمذى وحسنه الألباني في الصحيحة: (٩٣٠).

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمویێت: (إذا وُضِعَ العَشَاء لأَحَدَكُم و أُقيمتُ الصَلاَة، فَابْدَءُوا بالعَشاء، وَلاَ يَعْجَلْ حَتى يَفرِغ مِنْهُ)[1]. واتە: ئەگەر کاتی نوێژ کردن هات و نان دانرابوو بۆ خواردن، ئەوا نانەکە بخۆن و، پەلە مەکەن تا تەواو دەبن، ئەو کاتە هەستن بەدەم نوێژەکەتانەوە، بۆ ئەوەی دڵ سەرقاڵی خواردنەکە نەبێ و خەیاڵ نەڕوات بۆلای.

بێگومان دەبێ ئیش و کارەکە حەلاڵ و پاك بێ چونکە خوای گەورە وەری ناگرێت ئەگەر حەلاڵ نەبێ، خواردنی ماڵی حەرام دەبێتە هۆی گیرا نەبوونی دوعاو، بێبەش بوون لە خشوع و گەردن کەچی.

٦- زۆر سەرقاڵ نەبوون بە ئیش و کاری دنیاوە: بێگومان زۆر خەریك بوون و هەوڵدان بۆ دنیا لەسەر حسابی قیامەت دەکەوێ، قیامەت لەبیر دەباتەوە، ئەوەندە هەوڵ بدە بۆ ژیانی دنیا بەشی بژێوی خۆت و ماڵ و منداڵت بکات و پێویستی ڕۆژانەیان دەربکەیت، ئەگەر بەیانیان ئیشت هەبوو بەشی بژێوی دەکردی، ئەوا پەلاماری ئیش و کاری ئێواران مەدە، یان بە پێچەوانەوە.. ئەگەر بازرگانیەکت کرد و قازانجت کرد، ئیتر خۆت مەخەرە گێژاوی بازرگانی زۆرەوە، چونکە سەرقاڵ دەبی و ئەوکاتە مافەکانی خوات لەبیردەچێ، هەروەها مافی خێزان و منداڵەکانیشت لەدەست دەردەچێ، ئەو ماڵ و سامانەش فریات ناکەوێ لە ڕۆژی ڕەستاخێزدا.

*ئەنەس کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (من كانت الآخرة هَمَّه جَعَلَ الله غناهُ في قلبه، وجمع له شمله، وأتته الدنيا وهي راغمة، ومن كانت الدنيا همه، جعل الله فقره بين عينيه، وفرق عليه شمله، و لم يأته من الدنيا إلا ما قدرله)[2]. واتە: هەر کەسێك خەم و پەژارەی قیامەت بێت خوای گەورە دڵی دەوڵەمەند دەکات، ڕەتی کۆدەکاتەوە واتە زۆر سەرقاڵ نابێت بەدنیاوە، بەشی خۆشی پێ دەدات لە دنیا لەکاتێکدا ئەو دنیای ناوێت، ئەو کەسەش خەم و پەژارەی هەر دنیایە خوای گەورە وای لێ دەکات هەمیشە فەقیری و هەژاری بە بەرچاویەوە بێت، ڕەتیشی بلاو

---

(١) أخرجه البخاري: (٦٧٣)، ومسلم: (٥٥٩) عن ابن عمر.

(٢) رواه الترمذي، تحفه:(٢٥٨٣)، وفي الصحيحة: (٩٤٩).

دەکاتەوە هەمیشە سەرقاڵی دنیایە، کەچی ئەوەندەشی دەدرێتێ لە دنیا کە بۆی دیاری کراوە.

٧- قورئان خوێندن بە ڕەوانی: بیرکردنەوە لە مانای قورئان و یاد و پاڕانەوەی زۆر بەپێی سوننەت و لەکات و شوێنی تایبەتی خۆیاندا دڵ نەرم دەکەن و شەیتان دوور دەخەنەوە لە موسڵمان.

٨- پێش وەخت ئامادە بوون بۆ نوێژ: هەر کەس ئاوەها پێش وەخت ئامادە بوو ئیتر ئەوکاتە پەلە پەل ناکات بۆ ئەوەی بگات بە نوێژداو بە ڕاڕاییەوە ناچێتە ناو نوێژەوە و خشوعی لە دەست دەرناچێت..

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (إذَا أَتَيْتُمْ الصَّلاةَ فَعَلَيكُم بالسَكِينَة، ولا تَأتُوها وَأنْتُم تَسْعونَ فَمَا أَدْرَكْتُم فَصَلّوا، وَمَا فَاتَكُم فَأَتمُّوا)[1]. واتە: کاتێك هاتن بۆ نوێژ بە پەلە پەل و هەڵەداوان مەیەن بۆ نوێژ و پەلە پەل مەکەن، بەڵکو بە ئارامی و هێمنی و لەسەر خۆ بڕۆن بۆ نوێژ، ئەوەی پیا راگەیشتن ئەنجامی بدەن، ئەوەی لە دەستان چوو پاش سڵاودانەوەی ئیمام هەستنەوە تەواوی بکەن.

* لە ریوایەتێکی تردا ئەمەشی بۆ زیاد کراوە: (فإن أَحَدُكم إذا كان يعدُ الى الصلاة، فَهُوَ فِي الصّلاة)[2]. واتە: ئەگەر یەکێ لە ئێوە نیەتی نوێژکردن بوو، ئەوە بە نوێژ بۆی حسابە، گەرچی نەشگات بە نوێژی جەماعەتدا.

بۆ کەسێتی موسڵمان وا چاکە لەسەر خۆ بڕوا بەرەو مزگەوت و پەلە نەکات وەك ئەوەی کە شتێك قەومابێ، پێویست ناکات ئەوەندەش پەلە بکرێت مادەم نیەتی نوێژە لە ماڵ دەردەچێت تا دەگەڕێتەوە بەنوێژ بۆی دەنوسرێ.. بۆ ئەوەی پەلە پەل نەکەین و لەسەرخۆ بڕۆین بۆ نوێژ، با رەچاوی ئەم خاڵانەی لای خوارەوە بکەین:

١- زوو خەوتن و شەوخونی نەکێشان، چونکە ئەو کەسەی درەنگ بخەوێ خەبەری نابێتەوە بۆ نوێژی بەیانی و نوێژەکەی زۆر جار دەفەوتێ، کە دەچێ بۆ سەر کارەکەی ماندوو دەبێت زۆربەی رۆژ لەدوای نوێژی نیوەڕۆ دەگەڕێتەوە نانی نیوەڕۆ دەخوات، لەبەر هیلاکی

(١) أخرجه البخاري: (٩٠٨)، ومسلم: (٦٠٣).

(٢) أخرجه مسلم: (٦٠٢).

خەوی لێدەکەوێ و، ئاگات بە نوێژی عەسریشدا، خەوەکەی درێژە پێدەدا بۆ پێش مەغریب ئەوکاتە بە پەلە چوار دەنوك دەدات لە زەوی لە ترسی ئەوەی نەوەکا نوێژەکەی بفەوتێ، کاتێك شەویش هات زوو خەوی لێ ناکەوێ چونکە لە رۆژدا زۆر خەوتووە، شەو زۆر دەمێنێتەوە تا خەوی لێ دەکەوێ، دیسانەوە نوێژی بەیانی دەفەوتێ ئیتر ژیانی لەسەر ئەو شێوەیە بەردەوام دەبێ..

٢- سەعاتەکەتان یان موبایلەکەتان تەوقیت بکەن با پێش وەخت خەبەرتان بکاتەوە بۆ نوێژی بەیانی تا دوانەکەون.

٣- خوێندنی دوعاو زیکرەکانی پێش خەوتن کاریگەری باشیان دەبێت بۆ خەبەر بوونەوە و گەیشتن بە نوێژی بەیانیدا.

٤- زانینی کاتەکانی بانگ و نوێژ.

٥- گرنگی دان بەوەلأم دانەوەی بانگ و بەدەمەوە چوونی.

٦- بەجێ هێشتنی کاری دنیایی ئەگەر سەرقاڵ بویت پێوەی، خۆ ئەگەر بەلاتەوە زۆرگرنگ بوو، ئەوا بزانە کاری قیامەتی زۆر گرنگتر و لەپێشترە، بیر لەوە بکەرەوە چەندە خێرە نوێژ کردن لە کاتی خۆیدا، ئاگاداربە لە فێڵ و تەڵەکەی شەیتان کە داوی تەمەن درێژیت بۆ دەنێتەوە و دەڵێ: کاتێکی زۆرت لە پێشە ئیش و کارەکەت تەواو بکە جارێ تۆ گەنجی و تەمەنێکی زۆر دەکەی پەلەی نوێژکردنت چییە؟.

٧- دوور کەوتنەوە لە تاوان و گوناه، ترسان لە قەبر و قیامەت، ئەوانەش چەند هۆکارێکن یارمەتی نوێژخوێن دەدەن هەمیشە بیری بەلای نوێژەکەیەوە بێ.

٨- زۆر خۆ سەرقاڵ نەکردن بە دنیاوە و خۆهیلاك نەکردن، بەگرتنە دەستی چەند ئیش و کارێك، بێگومان دەبنە رێگر لەبەردەم پێش وەخت ئامادە بوون بۆ نوێژ.

٩- خۆ سەرقاڵ کردن بەکاری قیامەتەوە، بیرکردنەوە لە دەسەڵات و گەورەیی خوا و، قورئان خوێندن بە تێگەیشتنەوە، هاورێیەتی پیاوچاکان

١٠- تێ گەیشتن و فێربوونی ئەو ئایەت و فەرموودانەی کە باس لە خێر و گەورەیی ئامادەبوونی پێش وەخت بۆ نوێژ دەکەن.

ئیبن عومەر (رەزای خوایان لێ بێ) نوێژێکی بە جەماعەت رۆشت شەوەکەی تا بەیانی

شەونوێژ و عیبادەتی کرد!!.

زانای پایە بەرزی کورد (بدیع الزمان) مامۆستا سەعیدی نوورسی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) زۆر گرنگی دەدا بە نوێژەکانی و حەزی دەکرد هەر کە بانگیدا نوێژەکەی بکات، جارێك لەگەڵ هاوەڵانیدا پێنج خولەکی مابوو بگاتە ناو شار بانگیدا داوای لە هاوەڵانی کرد یەکسەر نوێژەکەیان بکەن و دوای نەخەن تا دەگەنە ناو شار..

جارێك کەلەپچەی لەدەستدا دەبێت دوو پۆلیس دەیبەن بۆ شاری بەتلیس، لە ڕێگا بانگیدا مامۆستا داوای لێکردن کەلەبچەکەی بکەنەوە بۆ ئەوەی نوێژەکەی بکات، بەڵام پۆلیسەکان بەقسەیان نەکرد، پاش تۆزێك بینیان کەلەپچەکە کرایەوە و هەڵی دایە بەردەمیان و نوێژەکەی کرد!! پۆلیسەکان سەریان سوڕما و زانیان ئەوە کەرامەت بوو خوا پێی‌دا، بە مامۆستایان وت تا ئێستا ئێمە پاسەوانی تۆ بووین ئیتر لەمەولا ئێمە خزمەتکارتین!!. جارێکیان لێیان پرسی چۆن ئەو کەلەپچەیە کرایەوە؟. فەرموی: منیش نازانم، بەڵام دیارە کەرامەتی نوێژ بوو!!.

١١- ڕێك ڕاوەستان و پاڵدان بەیەکەوە لە ریزەکانی نوێژدا: ڕێك ڕاوەستان لە نوێژدا بەشێکە لە تەواوی نوێژ، خۆشەویستی و برایەتی دەخاتە نێوان نوێژخوێنانەوە، خوای گەورە و مەلائیکەتەکانی دروود و سڵاوات دەدەن لەسەر ریزەکانی لای ڕاست، بەڵام لارو وێر وەستان لە ریزی نوێژدا جیاوازی دەخاتە نێوان دڵ و دەروونی نوێژخوێنان، دەبێتە هۆی کەمکردنی ئیمان و کوشتن و لە ناوبردنی خشوع، ئەوکاتە نوێژەکەش بە تەواوی ئەنجام نادرێت، بە بەڵگەی ئەم فەرموودانە:

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (سَوُّوا صُفُوفَكُمْ فَإِنَّ تَسْوِيَةَ الصُّفُوفِ مِنْ إِقَامَةِ الصَّلَاةِ)[1]. واتە: ریزەکانتان ڕێك بخەن با ریزەکانتان لار و وێر نەبێ، چونکە ڕێکخستنی ریزەکان بەشێکە لە تەواوی نوێژ.

* هەروەها فەرموویەتی: (أَقِيمُوا صُفُوفَكُمْ فَإِنِّي أَرَاكُمْ مِنْ وَرَاءِ ظَهْرِي. وَكَانَ أَحَدُنَا يُلْزِقُ مَنْكِبَهُ بِمَنْكِبِ صَاحِبِهِ وَقَدَمَهُ بِقَدَمِهِ)[2]. واتە: ریزەکانتان ڕاست بکەنەوە و پاڵ

---

(١) متفقٌ عليه: البخاري: (٧٢٣)، مسلم: (٤٣٣)، تحفة ١٤٨٩٦.

(٢) أخرجه البخاري: (٧١٨) (٧٢٥)، مسلم: (٤٣٤)، تحفة ٦٦٦.

بدەن بە پاڵی یەکترەوە، چونکە من لە پشت سەرمەوە دەتان بینم. ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: ئێمە شانمان دەنووساند بەشانی یەکترەوەو قاچیشمان دەلکان بەقاچی یەکترەوە لە ریزەکانی نوێژدا.

* ئەبو مەسعود (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی دەهێنا بەسنگ و بەسەر شانماندا و ڕێکی دەخستین و دەیفەرموو: (اسْتَوُوا وَلا تَخْتَلِفُوا فَتَخْتَلِفَ قُلُوبُكُم)[1]. واتە: ریزەکانتان ڕێك بخەن و پاڵ بدەن بەیەکەوە، ناڕێك مەوەستن با جیاوازی نەکەوێتە نێو دڵەکانتانەوە.

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (لَتُسَوُّنَّ صُفُوفَكُمْ، أو ليخالِفَنَّ اللهُ بين وُجُهِكُم) [2].واتە: یا ئەوەتا ریزەکانتان ڕێك و پێك دەکەن و ڕێك ڕادەوەستن یاخود جیاوازی دەکەوێتە نێوانتان.

* ئیبن عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ریزەکانتان ڕاست بکەنەوە و شان بنێن بەشانی یەکترەوە، بۆشاییەکان پڕبکەنەوە مەیەڵن ریزەکان لار و وێر بن، با کەلەبەریان تێدا نەبێ، بە نەرمی و بە هێواشی دەستی براکەتان ڕاکێشن و پاڵی بدەن بەخۆتانەوە ئەگەر تەنیا بوو لە دواوە، هیچ بۆ شاییەك مەهێڵنەوە بۆ شەیتان هاتوچۆی پێدا بکات، ئەو کەسەی بۆشایی پڕ بکاتەوە، خودایش بە ڕەحمەتی خۆی ئەو بەسەر دەکاتەوە، ئەو کەسەش ببێ بە هۆی دروستکردنی کەلێن لە ریزەکاندا، خواش پەیوندی لەگەڵ ئەو دەپچڕێ.

* ئەبوهوریرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (لَو يَعلَمونَ مَافِي الصَّف المُقَدَّم، مَاكانَت إلاّ قرْعَةٌ)[3]. واتە: ئەگەر خەڵکی بیانزانیایە خێری ریزی پێشەوە چەندە گەورەیە، بۆ کەس نەبوو بچێتە پێشەوە تاکو تیروپشکیان بۆ نەکردایە.

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (خَيرُ الصفوفِ الرّجال أوّلُها، وشرّها آخرها، وخير صفوف النِّساء آخِرُها وَ شرِّها أوّلُها )[1]. واتە: باشترین ریزی پیاوان ریزی یەکەمە،

---

(١) أخرجه مسلم: (٤٣٢).

(٢) أخرجه البخاري: (٧١٧)، ومسلم: (٤٣٦).

(٣) أخرجه مسلم: ( ٤٣٩).

خراپترین ریزیشیان ریزی دواوەیە، خێرترین ریزی ئافرەتان ریزی دواوەیە، خراپترین ریزیشیان ریزی پێشەوەیانە.

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (لَو يَعْلَمُ النّاسُ مَافِي النِداءِ و الصَفِ الأوَّل ثُمَّ لَم يَجدُوا إلا ان يَستهموا عليه لاَ سْتهموا وَلَو يَعلَمُونَ مَافِي التَهجير، لاَ سَتَبقوا إليه، وَلَو يَعلَمُونَ مافِي العَتمَتِ والصُّبح لأتوهُما وَلَو حَبواً)[٢]. واتە: ئەگەر ئەو خەڵکە دەیانزانی خێری بانگدان و ریزی یەکەمی نوێژی جەماعەت چەندە گەورەیە، ئەگەر دەشتیانزانی پێش وەخت ئامادەبوون بۆ نوێژ چەندە خێرە ئەوا پێش بڕکێیان بۆ دەکرد، هەروەها ئەگەر دەشیانزانی خێری نوێژی عیشا و بەیانی چەندە گەورەیە ئەگەر بە گاگۆڵکەش بوایە دەهاتن بۆی. پێشەوا بوخاری (بەرەحمەت بێ) لە کتێبی (فتح الباری)دا دەڵێت: مەبەست لە (التهجیر) نوێژی نیوەڕۆیە.

* ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی هەندێ لە هاوەڵانی لە دواوەن، پێی فەرموون: (رَأى في أصحابه تأخُّراً، فقال لَهُم: (تَقَدَمُوا فَأ تِموُّ بِي، وَلَيَاءتَمَّ بِكم مِن بَعدِكُم، لاَيَزال قومٌ يتأخرن، حتى يُؤَخِرَهُمُ اللهُ)[٣]. وەرنە پێشەوە و پەیڕەوی من بکەن، ئەوانەش لە دوای ئێوەوەن با پەیڕەوی ئێوە بکەن، کۆمەڵێك دەیکەن بەپیشە هەر دوادەکەون، هەتا خوای گەورەش لە پلەو پایە و پاداشتدا دوایان دەخات.

ریزی یەکەمی نوێژ بۆ پیاوان باشترین ریزە و خێرێکی گەورەی هەیە، بۆیە باش وایە موسڵمان پێش وەخت خۆی بۆ ئامادە بکات، هەروەها ڕێك راوەستان لە نوێژدا بەشێکە لە تەواوی نوێژ، خۆشەویستی و برایەتی دەخاتە نێوان نوێژخوێنانەوە، خوای گەورە و مەلائیکەکانی درووود و سڵاوات دەدەن لەسەر ڕیزەکانی لای ڕاست ( إنّ الله وملائكته يصلون على ميامين الصفوف)[٤]

---

(١) أخرجه مسلم: (٤٤٠)، والترمذي (٢٢٤) أبوداود: (١٧٧).

(٢) أخرجه البخاري (٦١٥)، ومسلم (٤٣٧).

(٣) أخرجه مسلم: (٤٣٨).

(٤) حسنه المنذري و ابن حجر.

دەگێڕنەوە سەعیدی کوڕی موسەیب (ڕەزا و ڕەحمەتی خوای لەسەر بێ) بیستساڵی ڕەبەق لە پێش بانگ لە ریزی یەکەمدا ئامادەی نوێژ کردن بووە.

سێیەم: پارێزگاریکردن لە کاتەکانی نوێژ: پێویستە نوێژەکان لە کاتی خۆیاندا بکرێن و دوانەخرێن و نەفەوتێنرێن.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتۡ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ كِتَٰبٗا مَّوۡقُوتٗا﴾ النساء: ١٠٣. واتە: بەڕاستی نوێژ هەمیشە لەسەر ئیمانداران فەرزێکی کات بۆدیاری کراوە. پێشەوا بوخاری (بەرەحمەت بێ) دەڵێت: (کاتەکەی دیاری کراوە، پێویستە لەسەرتان بەچاکی ئەنجامی بدەن لەکاتی خۆیاندا).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلۡوُسۡطَىٰ وَقُومُواْ لِلَّهِ قَٰنِتِينَ﴾ البقرة: ٢٣٨. واتە: ئاگاداری نوێژەکانتان بکەن، بەتایبەتی نوێژی ناوەڕاست کە نوێژی عەسرە، لە نوێژدا بوەستن بۆ خوا بە گەردنکەچی.

پێشەوا شافیعی (ڕەزا و ڕەحمەتی خوای لەسەر بێ) دەڵێت: پارێزگاری کردن لە شتێ ئەوەیە بە پەلە بیکەیت و بچیت بەدەمیەوە. هەروەها دەڵێت: هەرکەسێك پێش وەخت ئامادەبێ لە یەکەم کاتی نوێژدا نوێژەکەی بکات، باشتر پارێزگاری لە نوێژەکەی کردووە لەوکەسەی کە دوای دەخات و لە یەکەم کاتدا نایکات[1].

* ئیبن مەسعود فەرمووی: (سَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ أَيُّ الْعَمَلِ أَحَبُّ إِلَى اللَّهِ؟ قَالَ: (الصَّلاَةُ عَلَى وَقْتِهَا) . قَالَ ثُمَّ أَيُّ؟ قَالَ: (ثُمَّ بِرُّ الْوَالِدَيْنِ). قَالَ ثُمَّ أَيُّ؟ قَالَ(الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ)[2]. واتە: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ چ کردەوەیە خێر و گەورەیە لای خوا؟ فەرمووی: نوێژکردن لەکاتی خۆیدا. وتم دوای ئەو؟. فەرمووی: چاکە کردن لەگەڵ دایك و باوك. وتم: پاشان چی تر؟. فەرمووی: جیهاد و تێکۆشان لە پێناوی خوا.

(١) أحكام القرآن، الأمام الشافعي (رحمه الله) ص/ ٥٢ جمعه الامام البيقهي.

(٢) أخرجه البخاري: (٥٢٧)، ومسلم: (٨٥). تحفه: ٩٢٣٢.

پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژ کردنی خستە پێشی جیهاد و چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوکدا، روونیشی کردەوە کە خۆشەویسترین و چاکترین و ئەفزەڵترین کردەوەیە لای خوای گەورە.

* موصعەبی کوڕی سەعد (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: باوکە نابینی خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ٱلَّذِينَ هُمۡ عَن صَلَاتِهِمۡ سَاهُونَ ﴾ الماعون: ٥. واتە: ئەو نوێژخوێنانەی گوێ نادەن بە نوێژەکانیان و دڵی نادەنێ و لێی غافڵن. دەی کێمان سەهو ناکەین؟ کێ هەیە لە ئێمە دالغە لێ نەدات لە نوێژدا؟ باوکم وتی: کوڕی خۆم ئەمە مەبەستی ئەوە نیە، ئەوە فەوتانی کاتی نوێژەکانە سەرقاڵی شتی پڕوپوچ دەبن و دوایان دەخەن تا کاتەکەیان تەواو دەبێ و بەفیڕۆ دەڕوات[1].

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەحمەتی خوای لێ بێ) فەرمووی: هیچ شتێك نابینم وەك سەردەمی پێغەمبەر ﷺ وەك خۆی مابێت، وتیان: ئەی نوێژەکان، وتی: ئەی نابینن چییان بەسەر نوێژەکان هێناوە؟ دوایان دەخەن و لەکاتی خۆیاندا بەجێیان ناهێنن[2].

عوسمانی کوڕی ئەبو رەواد (رەحمەتی خوای لەسەر بێ) وتی: گوێم لە پێشەوا زوهری بوو دەیوت: چوم بۆلای ئەنەس لە دیمەشق دەگریا، وتم: بۆچی دەگریت؟ فەرمووی: هچ شتێك نابینم وەك خۆی مابێت جگە لە نوێژەکان، ئەوەتا نوێژەکانیش دوا دەخەن و لەکاتی خۆیاندا ئەنجامیان نادەن[3].

ئەنەس رەزای خوای لێ بێ لەو سەردەمە زێڕینەدا گریاوە، ئەی قوڕ بەسەر ئێمەی داماو لەم سەردەمە شەوە زەنگ و تاریکەدا دەبێ چی بکەین؟!.

* عوبادەی کوڕی صامت (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: شایەتی دەدەم کە من بیستم لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: (خَمْسَ صَلَوات إفْتَرضهُنَّ الله(عزوجل) مَنْ أَحْسَنَ وضُوْهُنَ، وصلاهُنَّ لِوَقْتِهِنَّ وَأتَمّ رُكوُعَهُنَّ وَسُجُودَهُنَّ وَخُشُوعَهُنَّ، كانَ لَهُ عَلى اللهِ

---

(١) أخرجه ابويعلى و صححه الألباني في الصحيح الترغيب والترهيب: (٥٧٦).

(٢) أخرجه البخاري: (٥٢٩).

(٣) أخرجه البخاري (٥٣٠).

عَهْدٌ أن يَغْفِرَلَهُ، وَمَن لَمْ يَفْعَل، فَلَيسَ لَهُ عَلى اللهِ عَهْدٌ، إن شَاءَ غَفَر لَهُ، وإنْ شَاءَ عَذَبَهُ)[1].

واتە: ئەو پێنج نوێژەی خوای گەورە فەرزی کردووە لەسەرتان، هەرکەسێ بە چاکی و رێك و پێکی دەستنوێژ بگرێ و، لەکاتی خۆیدا بەخشوعەوە بیانکات و، سەجدەکانیان و رکوعەکانیان بەتەواوی ئەنجام بدات، ئەو کەسە خوای گەورە پەیمانی داوە لێی خۆش ببێ، بەڵام ئەگەر وای نەکرد ئەوا هیچ بەڵێنێك لە نێوان خوای گەورە و ئەودا نیە، ئەگەر ویستی لێی خۆش دەبێ، یاخود سزای دەدات و تۆڵەی لێ دەسێنێ.

## چوارەم: پارێزگاریکردن لە نوێژی جەماعەت:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱرۡكَعُواْ مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ ﴾ البقرة.

واتە: نوێژەکانتان بەچاکی ئەنجام بدەن بە دروشمەکانیانەوە و زەکات بدەن، لەگەڵ ئەوانەدا بە جەماعەت نوێژ دەکەن، ئێوەش لە گەڵیاندا نوێژەکانتان بکەن. چونکە ئەوە مایەی یەکگرتنتانە و واتان لێدەکات بە هانا و هاواری یەکترەوە بچن .

پێشەوا(إبن كثير) (رەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێ: خوای گەورە فەرمانی کردووە بە ئوممەتی موحەممەد ﷺ کڕنووش بەرن لەگەڵ کڕنووش بەراندا و لەگەڵیان بن و لەوان بن و بە جەماعەت نوێژەکانیان بکەن. زۆر لە زانایان ئەم ئایەتەیان کردووە بە بەڵگە لەسەر فەرزبوونی نوێژی بەکۆمەڵ.

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ( صَلاَةُ الْجَمَاعَةِ تَفْضُلُ صَلاَةَ الْفَذِّ بِسَبْعٍ وَعِشْرِينَ دَرَجَةً)[2]. واتە: نوێژی جەماعەت خێری بیست و حەوت نوێژی تەنیای هەیە.

* هەروەها فەرموویەتی: (مَامِن ثَلاَثَةٍ في الْقَرْيَةِ، ولاَبَدْوٍ، وَلاَتُقَام فيهم الصَّلاَةَ إلا قَدْ استحْوَذَ عَلَيهْمُ الشَيْطَان، فَعَلَيكَ بالجَماعَة فإنَّما يَأكُلُ الذئبُ القَاصيَة)[3]. واتە: ئەگەر سێ کەس پێکەوە بوون جا گوندنشین بوون یان کۆچەری بە کۆمەڵ نوێژیان نەکرد، ئەوە شەیتان

---

(١) أخرجه مالك وأبوداود والنسائي، صحيح الترغيب والترهيب: (٣٧٠)

(٢) أخرجه البخاري: (٦٤٥)، ومسلم: (٦٥٠).

(٣) أخرجه أحمد، صحيح سنن أبن داود: (٥١)، وحسنه الألباني في المشكاة: (١٠٦٧).

زاڵ بووه بەسەریاندا، کەواتە ئەی موسڵمان بە جەماعەت نوێژەکانت بکە لەگەڵ جەماعەتی موسڵمانان بە، چونکە گورگ ئەو مەڕە دەخوات کە تەنهایە.

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ آمُرَ بِحَطَبٍ فَيُحْطَبَ، ثُمَّ آمُرَ بِالصَّلاَةِ فَيُؤَذَّنَ لَهَا، ثُمَّ آمُرَ رَجُلاً فَيَؤُمَّ النَّاسَ، ثُمَّ أُخَالِفَ إِلَى رِجَالٍ فَأُحَرِّقَ عَلَيْهِمْ بُيُوتَهُمْ)[1]. واتە: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە کە خوایە، نیازم کرد فەرمان بدەم چەند کەسێك دار بۆ سووتان لەگەڵ خۆیان بهێنن، قامەت بکرێ و یەکێك لە خۆیان دابنێم پێش نوێژییان بۆ بکات، خۆشم لەگەڵ ئەوانەی دارەکانیان پێیە بڕۆم ماڵی ئەو کەسانە بسوتێنم بە سەریاندا کە ئامادەی جومعە و جەماعەت نابن.

* ئەبوهوریرە فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (لَيْسَ صَلاَةٌ أَثْقَلَ عَلَى الْمُنَافِقِينَ مِنَ الْفَجْرِ وَالْعِشَاءِ، وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِيهِمَا لأَتَوْهُمَا وَلَوْ حَبْوًا)[2]. واتە: هیچ نوێژێك وەك نوێژی بەیانی و عیشا قورس نیە لەسەر مونافیقەکان، ئەگەر دەیانزانی چەندە فەزڵ و چاکەیان تێدایە بە گاکۆڵکەش بوایە خۆیان دەگەیاندێ.

ئوم دەرداء (ڕەزای خوای لێ بێ) وتی: ئەبو دەرداء هاتەوە بۆ ماڵ زۆر تورە دیار بوو، پێم وت: چی وا تورە و بێ تاقەتی کردووی؟. فەرمووی: سوێند بە خوا هیچ شتێك نابینم وەك خۆی مابێتەوە لەناو ئومەتی پێغەمبەردا ﷺ گۆڕانکاری تێدا نەکرابێ تەنها نوێژی جەماعەت نەبێ کە بەکۆمەڵ دەکرێ[3]. مەبەستی ئەوە بوو نوێژەکان کەم و کوڕی و گۆڕانکاریان تێدا کراوە، ئەوە لە کۆتایی ژیانی ئەبو دەرداو و کۆتایی خەلافەتی عوسمانی کوڕی عەففاندا (ڕەزای خوای لێ بێ) بووە، ئەی هاوار دەبێ ئێمە لەم سەردەمەدا حاڵمان چی بێ؟!..

---

(١) صحيح البخاري: (٦٤٤)

(٢) متفق عليه: البخاري: (٦٥٧)، و مسلم: (٢٥٢).

(٣) أخرجه البخاري: (٦٥٠)، تحفة: ١٠٩٨٢.

# نوێژی ڕاستەقینە

نوێژی ڕاستەقینە ئەو نوێژەیە کە ئیسلام داوای دەکات، نوێژ تەنها بریتی نیە لە چەند وتەیەك بە زمان بوترێ، یان چەند جوولەیەك کە ئەندامەکانی جەستە ئەنجامی بدەن بەبێ وردبوونەوە و تێگەیشتن لە ماناکەی، بەبێ گەردن کەچی و بێداری دڵ..

ئەوە نیە کەڵەشێر ئاسا چەند دەنووکێك بدرێت لە زەوی ئاوەها چەند سەجدەیەك ببرێ و تەواو.. نەخێر نوێژی ڕاستەقینە ئەو نوێژەیە مافی خۆی پێبدرێ بە بیرکردنەوە و وردبوونەوە لە ماناکەی ، هۆشیاری دڵ و گەردنکەچی ، ترسان لە خوا و بە گەورەگرتنی.. ئەوەیە مەبەستی یەکەم لە نوێژ کردن و بگرە پەرستشەکانی تریش.

حاتەمی ئەصەم (بەرەحمەت بێ) کە یەکێك بووە لە خوا ناسان، ڕۆژێکیان لێیان پرسی تۆ چۆن نوێژ بەجێ دێنیت؟!. لە وەڵامدا فەرمووی: من کاتێك نوێژ ئەنجام دەدەم وا هەست دەکەم خوای گەورە بە راسەرمەوەیە، پردی سیرات (صراط)یش لە ژێر پێمدایە، گۆڕیش لە پێشمەوەیە، مەلائیکەی گیان کێشان بە شوێنمەوەیە، بەهەشت لە لای راستمەوەیە و دۆزەخیش لای چەپمەوە.. ئا بەو شێوەیە نوێژەکەم ئەنجام دەدەم پاشان نازانم خوای گەورە لێی وەرگرتووم تا پیرۆزبایی لە خۆم بکەم، یان داویەتیەوە بەسەرمدا، تا سەرەخۆشی لە خۆم بکەم.

نوێژکردن بۆ یادکردنی خوای بەرز و بڵند و پایەدارە، ئەو خوایەی کە ئادەمیزاد و هەموو شتێکی بە جوانی و ڕێك و پێکی بەدیهێناوە، ئەو زاتەی کە نەخشەی کێشاوە بۆ هەموو شتێك و ڕێنموونی کردووە.

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ ﴾ طه: ١٤. واتە: بەدڵێکی بێدارەوە نوێژەکانت بەچاکی ئەنجام بدە، تا هەمیشە منت لە یادبێت.

خوای گەورە هەڕەشە دەکات لەو کەسانەی پشت لە زیکر و بەرنامەی ئەو دەکەن بەوەی لە قیامەتدا پشت گوێ دەخرێن و بە کوێری حەشر دەکرێن:

﴿ وَمَنۡ أَعۡرَضَ عَن ذِكۡرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةٗ ضَنكٗا وَنَحۡشُرُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ أَعۡمَىٰ ١٢٤ قَالَ

﴿ رَبِّ لِمَ حَشَرْتَنِىٓ أَعْمَىٰ وَقَدْ كُنتُ بَصِيرًا ﴿١٢٥﴾ قَالَ كَذَٰلِكَ أَتَتْكَ ءَايَٰتُنَا فَنَسِيتَهَا ۖ وَكَذَٰلِكَ ٱلْيَوْمَ تُنسَىٰ ﴾
طه: ١٢٤ - ١٢٧.

رۆحی پەرستش بریتییە لە دوعا و پاڕانەوە و هانا بردن بۆ خوای پەروەردگار، دەی نوێژیش گەورەترین زیکر و پاڕانەوەیە و گەورەترین بەندایەتی جەستەیە.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (الدُّعاء هُوَ العبادة)[1]. واتە: نزاو پاڕانەوە عیبادەتە.

پێویستە عەقڵ ئامادە و هۆشیار بێ لە نوێژدا وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَقْرَبُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعْلَمُوا۟ مَا ﴾النساء:٤٣. واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە نزیکی نوێژ مەکەون لە کاتێکدا سەرخۆشن هەتا سەرخۆشییەکەتان نامێنێ بۆ ئەوەی بزانن دەڵێن چی..

ئەمە لە کاتێکدا بووە کە عەرەق و شەراب حەرام نەکرابوو.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمَا كَانَ صَلَاتُهُمْ عِندَ ٱلْبَيْتِ إِلَّا مُكَآءً وَتَصْدِيَةً ﴾الأنفال: ٣٥. واتە: نوێژی ئەوان جگە لە فیکە فیك و چەپڵە لێدان هیچ شتێکی تر نیە.

بێگومان بێ بڕواکان شتێکیان دەکرد ناویان لێ نابوو نوێژ، بە دەوروبەری کەعبەدا دەسوڕانەوە بە فیکە فیك و چەپڵە لێدانەوە..

ئەم ئایەتانەش بەڵگەن لەسەر ئامادەبوونی عەقڵ لە نوێژدا، چەند نوێژخوێنی وا هەیە سەرخۆشیش نییە ئاگای لە نوێژەکەی نیە و نازانێ دەڵێ چی، بەڵام نەزانی و بێ ئاگایی سەرخۆشی کردووە، خۆشەویستی دونیا و شوێن کەوتەی هەوا و هەوەس و ئارەزوو بێ ئاگاو غافڵی کردووە.

خوای گەورە ئادەمیزادی ئاگادار کردووەتەوە کە ئەگەر نوێژەکانیان بەچاکی و لەکاتی خۆیدا بەئەنجام نەگەیەنن و لێی غافل بن و سستی و تەمەڵی تێدا بکەن، ئەوە هاوار و واوەیلا بۆ ئەوانەیە.

---

(١) الترمذي: (٣٢٤٧)، وأحمد: (٤/٢٧١).

خوای گەورە دەفەرمویّت: ﴿ فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ﴿٤﴾ الَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ ﴾ الماعون: ٤ - ٥. واتە: لە قیامەتدا وەیل و فەوتان و قورِ بەسەری بۆ ئەو دوورِوانەیە لە نوێژ کردنی راستەقینە بیّ ئاگان.

پرسیاریان کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی (ساهون) فەرمووی: (ئەوانەن نوێژەکانیان دوا دەخەن و لەکاتی خۆیاندا ئەنجامیان نادەن)[1]

سەعدی کورِی ئەبی وققاص و مەسروقی کورِی ئەجدەع (رەزای خوایان لیّ بیّ) فەرمویانە: وشەی (السهو) مەبەستی لەو کەسەیە نوێژەکەی ناکات تا کاتەکەی دەرِوات[2]

ئیبن عەباس (رەزای خوایان لیّ بیّ) فەرموویەتی: کردنی دوو رکات نوێژ بە تێگەیشتن و تێفکرینەوە خێرترە لە شەونوێژی شەوێك کە بە دڵێکی بیّ ئاگاوە ئەنجام بدرێت.

هەندیك لە پیاوانی سەلەفی صالح (رەزای خوایان لیّ بیّ) گوتویانە: نەبوونی خشوع لە نوێژدا، وەك ئەوە وایە کەسێك کەنیزەکێك بە دیاری بیات بۆ یەکێك لە پاشاکان جا چۆنە بە لاتانەوە ئەگەر ئەو کەنیزەکە کوێر یان شەل یان کەرِ بێت یاخود دەست و قاچی برِا بوو یان بەد رەوشت بوو؟ بێگومان خوا خۆی چاکەو هەر شتێکیش چاك نەبێت وەری ناگریّ، نوێژی بیّ رۆحیش لەکردەوە چاکەکان نیە[3]!.

خوای گەورە دەفەرمویّت: ﴿ وَاسْتَعِينُوا بِالصَّبْرِ وَالصَّلَاةِ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلَّا عَلَى الْخَاشِعِينَ ﴾ البقرة: ٤٥. واتە: پشت ببەستن بە ئارامگری و نوێژ، نوێژ زۆر زەحمەتە مەگەر لەسەر ئەوانە ی ملکەچن. (إبن كثير) دەفەرمویّت: بەپشت بەستن بە نوێژ و ئارام گرتن داوای بە هەشت بکەن، چونکە نوێژ گەورەترین یارمەتی دەرە بۆ دامەزراوی لەسەر گویرِایەڵی و فەرمانبەرداری.

---

(١) كتاب الصلاة: لإبن قيم الجوزية(رحمه الله).

(٢) كتاب الصلاة: لإبن قيم الجوزية (رحمه الله).

(٣) كتاب مدارج السالكين لإبن قيم الجوزية (رحمه الله): (١/٥٢٦).

بەڵێ نوێژ و خۆڕاگری ئەرکی گەورە و گرانن، بەڵام لەسەر ئەو کەسانەی کە بە خشوعەوە عیبادەت بۆ خوای خۆیان دەکەن ئاسانە و مایەی ئارامی دڵ و دەروونیانە.

ئەو نوێژەی کە بە هۆشیاری و خشوعەوە دەکرێت، ڕووناکی چاوی پێغەمبەری خوا ﷺ بووە، بۆیە هەرکاتێك ناخۆشیەك ڕووی تێ بکردایە هانای دەبرد بۆ نوێژ کردن: (إِذْ حَزَبَهُ أَمْرٌ صَلى)[1].

هەروەها بیلالی بانگ دەکرد و پێی دەفەرمووە: ئەی بیلال! هەستە بانگ بدە و قامەت بکە با نوێژ بکەین و دڵمان ئارام بێت و بەختەوەر بین، هەست بەخۆشەویستی و ئارامی بکەین!.

نەك ئەو نوێژە بێ ڕوحەی ئێمە کەڵەشێر ئاسا چەند دەنوکێك دەدەین لە زەوی وا دەزانین ئیتر هیچمان نەهێشتووەتەوە، جا بۆیە پێویستە نوێژەکانمان بەتەواوی ئەنجام بدەین، حەقی خۆیان پێ بدەین..

نوێژی ڕاست و دروستە کە لە کاتی بەڵاو ناخۆشی و خەم پەژارەدا دەبێ پشتی پێ ببەسترێت، چونکە گەڕانەوەیە بۆ لای خوا.. ئەوکاتە بەندە هەست دەکات بە نزیك بوونەوە لە خوای خاوەنی ئاسمانەکان و زەوی، هەست دەکات کە خوای لە گەڵدایە، هەست دەکات خوا خاوەنیەتی و داڵدەی دەدات، هەنگاو دەنێ بەرەو سەرکەوتن و سەرفرازیی، بەرەو ڕەزامەندی خوا، بەرەو ئەو بەهەشتەی کە پانتاییەکەی بەقەد ئاسمانەکان و زەوییە، ئەوەی لە ناویدایە نە بەچاو بینراوە، نە بەگوێ بیستراوە، نەهاتووە بەدڵی کەسدا، ئەوەی ئارەزووی بکات لە ناویایەتی.

موسلیمی کوڕی یەسار (بەرەحمەت بێ) لە مزگەوتی بەصرە نوێژی دەکرد مزگەوتەکە لە لایەکیەوە ڕووخا هەستی پێ نەکرد تا لە نوێژەکەی بوویەوە ئەوەندە سەرقاڵی نوێژەکەی بوو بە ئامادەیی دڵ و خشوعەوە[2]!.

---

(١) صحيح سنن أبي دواود: (١١٧١).

(٢) إحياء علوم الدين للغزالي رحمه الله: (١/٣٥٠).

* پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو کەسەی رکوع و سەجدەکەی تەواو نەکات بە دزترین کەس وەسفی کردووە، کە دیارە دزیش شتێکی بێزراو و ناپەسەندە لە شەرعدا: (أَسْرَقَ النّاسِ الذي يَسْرِق صَّلاتَهُ، لا يُتِمّ رُكوعَهَا وَ سُجُودُهَا)[1].

هەروەها هەرکەسێ رکوع و سەجدەکەی تەواو نەبێ هەڕەشەی لێکراوە کە ئەگەر لەسەری بمرێت، ئەوا لەسەر رێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ نامرێت پەنا بە خوای گەورە!.

* حوزەیفە (رەزای خوای لێ بێ): پیاوێکی بینی رکوع و سەجدەکەی تەواو نەبوو، کاتێك لە نوێژەکەی بوویەوە، حوزەیفە وتی: تۆ نوێژت نەکرد.. ئەبو وائیل دەڵێ: وا دەزانم وتیشی: ئەگەر بمرێ لەسەر غەیری سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ دەمرێت[2].

ئامادەیی دڵ و نەبوونی غەفڵەت گرنگترین مەرجی مەعنەوین بۆ نوێژ، چونکە ئەو کەسەی دڵی بێدار و سەرقاڵ نەبێت سوود لە قورئان خوێندن و هەڵسوکەوتەکانی ناو نوێژ نابینێت، بۆیە دەبێت نوێژخۆێن بزانێت لە بەردەم پەروەردگاری دا راوەستاوە و لەرێی نوێژەوە گفتوگۆی لەگەڵ دەکات و لێی دەپاڕێتەوە، جا کەواتە چاك خۆت ئامادە بکە و بایەخ بدە بە نوێژەکانت، بە ئارام و لەسەرخۆ و هۆشیارانە بیخوێنە، روکنەکانی بەتەواوی ئەنجام بدە، پارێزگارییان لێ بکە، تا وەکو سەرفراز و سەرکەوتوو بیت لە دنیا و قیامەتدا.

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (لا تزول قدما عبد يوم القيامة عند ربه حتى يسال عن أربع: عن عمره فيما افناه، وعن علمه ماذا عمل فيه، وعن ماله من اين اكتسبه وفيما انفقه، وعن جسمه فيم ابلاه)[3]. واتە: بەندە لە رۆژی قیامەتدا رادەوەستێ و ناجوڵێت تا چوار پرسیاری لێدەکرێت: تەمەنەکەی لەچیدا بەسەر برد، چ کارێکی کرد بە زانست و زانیاریەکەی، ماڵ و سامانەکەی چۆن پەیداکرد و لە چیدا خەرجیکرد، جەستەی لە چیدا بەکارهێنا تا مردو و چووە ناو گۆڕ و رزی، ئایا تەمەنەکەی لە بەندایەتی و چاکەدا بەسەربرد یان لەشتی بێهودەدا؟!. ئایا زانست و زانیارییەکەی و ماڵ و سامانەکەی لە

---

(١) الطبراني في المعاجم الثلاثة وحسنه لغيره الألباني في صحيح الترغيب والترهيب: ٥٢٥.

(٢) صحيح البخاري: (٣٨٩)، تحفة: ٣٣٤٤.

(٣) صحيح السنن الترمذي: ( ٢/٢٩٠).

خزمەتکردنی خەڵکدا بەکارهێنا یان نا؟. ئایا ئەو جەستە جوانەی بۆ خواپەرستی و عیبادەت بەکارهێنا یان لە ڕێگەی تێرکردنی ئارەزووەکانیدا بە حەرامی بەکارهێنا؟.

* ڕوبیعەی کوڕی کەعب (ڕەزای خوای لێ بێ) پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: حەزدەکەم لە قیامەتدا هاوەڵت بم لە خوای گەورە بۆم بپاڕێرەوە کە لە بەهەشتدا پێکەوە بین؟ فەرمووی: (دەی تۆش یارمەتیم بدە بە زۆر سەجدە بردن)[1].

* هەروەها دەفەرمویێت: (أَقْرَبَ مَايَكونَ العَبْدُ مِن رَبِّه وَهُوَ ساجِدٌ، فَأَكْثَروا الدعاء)[2]. واتە: هیچ کاتێك بەندە وەك کاتی ناو سەجدە لە پەروەردگارییەوە نزیك نابێتەوە، کەواتە لەوکاتەدا دوعای زۆر بکەن. بێگومان دوعا و پاڕانەوەی ناو سەجدە گیرایە.

ئیبن عەبباس و عەتای خۆراسانی (ڕەزای خوایان لێ بێ) دەڵێن: بەندەی ئیماندار لە هەر جێگەیەکدا سەجدە ببات ئەو شوێنە لە قیامەتدا شاهیدی بۆ دەدات، کاتێك ڕۆحیشی دەرچوو بۆی دەگری[3].



---

(١) أخرجه مسلم: (٤٨٩).

(٢) أخرجه مسلم: (٤٨٢).

(٣) إحياء علوم الدين لإمام الغزالي رحمه الله: (١/٣٥١).

# با جگەرگۆشەکانمان فێری نوێژ بکەین

منداڵ ئەمانەتی خوای گەورەیە لای دایك و باوکی و بەرپرسیارن لێی لە قیامەتدا، جا بۆیە پێویستە لەسەریان منداڵەکانیان هەر لە سەرەتاوە رابهێنن لەسەر نوێژ کردن ، بە حیکمەت و پەند و ئامۆژگاری جوان فێری رەوشتی بەرزیان بکەن تا لە دوارۆژدا سودیان بۆ خۆیان و دایك و باوکیان و بگرە بۆ کۆمەڵگەکەشیان هەبێت، ئەگەر منداڵ لە سەرەتاوە راهێنرا لەسەر نوێژ زۆر زەحمەتە بەلایەوە تەرکی بکات لە دوایدا، جا بۆیە پێویستە لەسەر باوك لەگەڵ خۆیدا منداڵەکانی بەرێت بۆ مزگەوت، خۆشەویستی ئیسلام و مزگەوت و پەرستش لە دڵی منداڵەکانیدا بچێنێت.

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ ﴾ التحريم: ٦. واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە خۆتان و خاو و خێزانتان بپارێزن لەوئاگرەی سوتەمەنیەکەی بەرد و مرۆڤەکانە.

ئیمام عەلی (رەزای خوای لێ بێ) دەربارەی ئەم ئایەتە دەفەرموێت: فێری رەوشتی جوانیان بکەن و ئەدەبیان دابدەن .

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (إعملوا بطاعة الله و اتقوا معاصي الله، و مروا أولادكُم بامتثال الأوامر، وإجتناب النواهي، فذالك وقاية لهم ولكم من النار)[1] واتە: فەرمانبەرداری خوا بکەن، خۆتان بپارێزن لە کار و کردەوەی ناشیرین و تاوان،فەرمان بکەن بە منداڵەکانتان پەیڕەوی فەرمانەکانی خوا بکەن، لەو شتانەش خۆیان بە دوور بگرن کە قەدەغە کراون، بەوەش خۆیان و ئێوەش دەپارێزن لە سزای ئاگری دۆزەخ.

خوای گەورە فەرمانی داوە بە هەموو کەسێك دەبێت فەرمان بکات بە کەس و کاری نوێژ بکەن، خۆشیان خۆراگر و بە ئارام بن لە سەری:﴿ وَأۡمُرۡ أَهۡلَكَ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱصۡطَبِرۡ عَلَيۡهَا ﴾

---

(١) رواه ابن جرير، وإبن المنذر من حديث ابن عباس.

طه: ١٣٢. واتە: فەرمان بدە بە خێزان و کەسەکانت بۆ نوێژ کردن، خۆشت هەوڵ بدە کە زۆر خۆراگر بیت لە سەری..

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (مروا أولادكُم بالصلاة وَهُم أبناء سَبع، وَاضرِبُهُم عَلَيها وهُم أبناء عَشر،وَفَرقوا في المَضاجع)[1]. واتە: منداڵەکانتان لە حەوتساڵیدا فێری نوێژ بکەن، لە دە ساڵیدا لەسەر نەکردنی لێیان بدەن بە لێدانێکی سووك، جێگای خەوتنیان لێك جیابکەنەوە با پێکەوە نەخەون لە ژێر یەك پێخەفدا.

ئەمەش بۆ ئەوەیە منداڵ لە سەرەتاوە خوو بگرێت بە پەرستشەوە و رابێت لەسەری، پەروەردە بێت لەسەر گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری بۆ خوا، پارێزگاری لە مافەکانی بکا، سوپاسگوزار بێ، پشت تەنها بەو ببەستێ، زوو زوو بگەڕێتەوە بۆ لای، متمانەی تەواوی پێی هەبێ، تەسلیم بێ بە زاتی خوا.. تا بەو پەرستشانە روحی پاك ببێتەوە، جەستەی چالاك بێ، خووڕەوشتی جوان بێت، گوفتار و رەفتاری چاك بێت!.

بۆ ئەوەی چاندنی بیروباوەڕ لە دڵدا بەهێز بێت پێویستە منداڵ بە هەموو جۆرە پەرستشێك ئاو بدرێت بە تایبەتی (نوێژ) تاکو لە دڵی منداڵدا گەشە بکا و پەل و پۆ بهاوێت و، خۆڕاگر بێت لە بەرامبەر گێژەڵوکەی ژیان.

* مالیکی کوری حویرث (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کۆمەڵێك لاوی هاوتەمەن رۆشتینە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بیست رۆژ لای ماینەوە هەستی کرد بیری ماڵ و منداڵەکانمان دەکەین پرسیاری دەربارەیان لێکردین، ئێمەش حاڵ و ژیانی ئەوانمان بۆ گێڕایەوە، ئەویش زۆر بە رەحم و بە بەزەیی بوو، فەرمووی: (إرجعُوا الى أهليكُم فَعلمُهُم وَ مَروهُم، صَلّوُا كَما رَأَيْتُموني أُصَلي فإذا حَضَرت الصّلاة فَليُؤَذن لَكم أَحَدُكُم وَلَيَؤُمَّكُم أَكبُرُكُم)[2]. واتە: بگەڕێنەوە بۆ ناو کەسوکار و منداڵەکانتان فێریان بکەن و فرمانیان پێ بکەن، نوێژ بکەن بەو شێوەیەی کە من دەبینن دەیکەم، کاتی نوێژ هاتە پێشەوە با یەکێکتان بانگ بدات و گەورەترینتان پێش نوێژیتان بۆ بکات.

---

(١) أخرجه أبو داود في الصلاة: (٤٩٥).

(٢) متفق عليه، المشكاة: (٦٨٣).

* **پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت:** (كُلكُم راعٍ وَ كُلكُم مَسؤولٌ عَن رَعيّتهِ)[1].
**واتە: هەمووتان شوانن و بەرپرسیارن لە ژێردەستەكانتان.**

* **هەروەها دەفەرموێت:** (إنّ اللهَ سائِلُ كُل راعٍ عمّ استرعاه أَحَفظ اَم ضَيَّعَ؟ حتّى يسأل الرَّجُلَ عَن أهل بَيته)[2]. **واتە: خوای گەورە پرسیار لە سەركارەكان دەكات دەربارەی ئەوەی لە بەردەستیاندا بووە، كە ئایا مافی پاراستووە یان فەوتاندوویەتی؟ تەنانەت پیاویش دەربارەی خێزانەكەی پرسیاری لێ دەكرێت.**

**پێشەوا غەزالی** (رەحمەتی خوای لێ بێ) **دەڵێت: جوتیار چۆن درەختەكان و كشتوكاڵەكەی لە درِك و داڵ و گیا نامۆكان دەپارێزێت و پەروەردەی دەكات دەبێت منداڵیش ئاوەها بپارێزرێت لە كاری ناشیرین و ناپەسەند لە لایەن پەروەردەكارەكەیەوە .**

منداڵ كاتێك لە دایك دەبێ لەسەر فیترەتی پاك لە دایك دەبێ، جا ئەگەر لە **ماڵەوە پەروەردەیەكی چاك و شیاوی بۆ رەخسا، تێكەڵاوی چاكی كۆمەڵایەتی بۆ گونجا، لە ژینگەیەكی ئیمانیدا گەشەی كرد ئەوا بێگومان ئەو منداڵە دەبێتە خاوەنی ئیمانێكی پتەو** و دامەزراو، رەوشتی بەرز و جوان دەبێت، **پەروەردەیەكی چاك و جوان** وەردەگرێت..ئەو **راستیەش قورئان دوپاتی كردووەتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرموودەكانیدا ئاماژەی بۆ كردووە. زانایانی بواری پەروەردە و رەوشت یەك دەنگ و هەماهەنگن لە سەری.**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ﴾ الروم: ٣٠. **واتە: دینێكی بنەڕەتیەو لەسروشتدا خوا ئەو خەڵكەی هەر لەسەر یەكتاپەرستی وەدی هێناوە كاری خودا گۆڕانی بەسەردا نایەت، دینی پتەو و پایەدار هەر ئەمەیە.**

---

(١) أخرجه البخاري: (٥٠٢)، ومسلم: (١٠٢٦).

(٢) رواه النسائي وإبن حبان، سلسله الأحاديث الصحيحة: (١٦٣٦).

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (كَلُّ مَولودٍ يُولَدُ على فِطرةٍ، وَ إنّما أَبَواه يُهَوِدانِه أَو يُمَجسانِهِ أَو يُنَصرانِه)[1]. واتە: هەموو منداڵێك لەسەر فیترەتی پاكی ئیسلام لە دایك دەبێت، دایك و باوكی دەیكەن بە جولەكە یان ئاگر پەرست یان گاور.

منداڵ لەسەر فیترەتی پاك و بێگەرد و سروشتی سادە لە دایك دەبێ، خۆ ئەگەر دەروونی سادە و ساكاری بەرەو رووی هەر رەوشتێكی جوان بوویەوە ئەوا وێنەكەی لە سەری نەخشە دەكێشرێت، پاشان ئەو وێنەیە هێدی هێدی زیاد دەكات، تا وای لێ دێت كە هەموو لایەنەكانی دەروون دەگرێتەوە و دەبێتە چۆنیەتییەكی پتەو و تێیدا بەرجەستە دەبێ بۆی لەكاركردن بە دژەكەی[2].

راغبی ئەسفەهانی وتویەتی: خەلیفە مەنصور ناردی بۆ لای ئەو ئەمەوییانەی لە زیندانەكانی ئەواندا بوون كە پێیان بڵێن و پرسیاریان لێبكەن: چی زۆر نارەحەتی كردوون لە زینداندا؟. وتیان: تەنها بۆ پەروەردەی منداڵەكانمان كە لە دەستمان چووە!. [3]

# پەیوەندیی نوێژ بە ژیانەوە

لە راستیدا نوێژ گەورەترین بەندایەتی و عیبادەتە، بە تەنها مەبەست لە نوێژ ئەوە نیە كە بەهەشتی پێ بەدەست بهێنرێت، بەڵكو ئیسلام ئایینی كۆمەڵایەتییە، پەیوەندی هەیە بە ژیانەوە، ژیانیش بەبێ ئایین هیچ مانایەكی نیە..ئایین هەمووی عیبادەتە، عیبادەتیش هەموو ژیان دەگرێتەوە و كاروبارەكان رێك دەخات بەپێی بەرنامەی پەروەردگار لە چوونە سەرئاوەوە بگرە تا دەگاتە خواردن و خواردنەوە و، یاسای كاروباری حكومەت بەڕێوەبردن و، بازرگانی كردن و، پەیوەندی نێوان وڵاتان..

نوێژ پەیوەندییەكی بەتینی هەیە لەگەڵ ژیانی موسڵماندا، كاریگەری هەیە لەسەر رەوشتی، ئاوێنەی كردەوەكانییەتی بەچاك و خراپیانەوە، كاریگەری هەیە لەسەر راستگۆیی

---

(١) أخرجه البخاري: (١٣٨٥)، وأبو داود: (٤/٢٧٤).

(٢) تربيه النبويه للطفل، محمد نور سويد.

(٣) تربية الاولاد في الاسلام، د.عبدالله ناصح علوان وەرگێڕانی بۆ كوردی ناصح ئیبراهیم سازانی

لە هەڵس و کەوت لە مامەڵەکردندا، لە پاراستنی ئەمانەت و دەست پاکی، ڕەوشتی بەرز و جوان، لێبوردەیی، ئازار نەدانی خەڵك، چاك بوون لەگەڵ دایك و باوك، ماڵ و منداڵ و خزمان و دراوسێ..

نوێژ پەیوەندی هەیە بە سەرکەوتنی کۆمەڵەوە، بێگومان ئەگەر ئەندامەکانی کۆمەڵ نوێژ بکەن و ڕووبکەنە مزگەوتەکان، ئەو کاتە نوێژەکەیان دووریان دەخاتەوە لە خراپەکاری و دزی و بەدڕەوشتی.. هەرگەل و کۆمەڵێکیش لە تاوان و خراپە بەدوور بوو ئەوە گەلێکی سەرکەوتوو بەختەوەرە، ئەوە سەرکەوتن نیە لەم سەردەمەی ئێستادا کە دەبینین لەگەڵ ئەو هەموو پێشکەوتنەدا ڕۆژ بە ڕۆژ کۆمەڵگاکان بەرەو داڕمان دەچن، ئەو هەموو جەنگ و وێرانکارییە، ئەو هەموو ڕاوو ڕووتە ئەنجامی چییە؟!! ئەو هەموو بەرەڵایی و بەدڕەوشتییە خزمەتی کێ دەکات!.

نوێژکردن هۆی ئارامی و بەختەوەرییە، پەیوەندی و برایەتی و یەکسانی دەخاتە نێوان موسڵمانانەوە، وەك لە مزگەوتەکاندا بە ئاشکرا دەبینرێت، جیاوازی نیە لە نێوان هەژار و دەوڵەمەند، دەسەڵاتدار و بێدەسەڵات، گەورە و بچوك، ڕەش و سپی، ڕەگەز و زمان، هەر هەموویان ڕیز دەبەستن پێکەوە و یەك ئامانجیان هەیە.

* سەعد (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (إِنَّما يَنصُرُ اللَّهُ هذهِ الأُمَّةَ بِضَعِيفِهَا بِدَعوَتِهِم وَ صَلاتِهِم وَ إِخلاصِهِم)[1]. واتە: خوای گەورە ئەم ئومەتە سەر دەخات بە نوێژ و دوعا و پاڕانەوە و ئیخلاصی فەقیر و هەژارەکانتان.

ئەمەش پێچەوانەی ئەو بیرو بۆچونانەیە کە دەڵێن پشت بە دەوڵەمەند و خاوەن پلەو پایەو بەهێزەکان ببەستن و فەقیرەکان فەرامۆش بکەن، ئەوەتا هەژارەکان لەم سەردەمەدا فەرامۆشکراون لە هەندێ شوێن بە سووکی سەیریان دەکەن، دەی جگە لە چەشتنی تاڵی ئەو کردەوەیە مرۆڤایەتی چی زیاد کردووە؟!. جگە لە داڕمان و زەلیلی و وون بوون لەناو گێژاوی نەفامیدا مرۆڤایەتی چی تری دەست کەوتووە؟ بۆ فەقیر و هەژارەکان خوا دروستی نەکردوون؟ حەز بە ژیان ناکەن؟ دەی بابیینە یارمەتی دەریان و داوای دوعایی خێریان لێ بکەین، بۆ ئەوەی ڕزگارمان ببێ لەو هەموو بەڵاو ناخۆشییانەی ڕووی تێکردووین.

---

(١) أخرجه البخاري: (٨٩٦) وصححه الألباني في صحيح الترغيب و الترهيب: (٥).

بێگومان یەکێك لە حیکمەتەکانی خێر و چاکەی دەوڵەمەندەکان بەرامبەر فەقیر و هەژارەکان بۆ ئەوەیە خۆشەویستی نێوان هەژار و دەوڵەمەندەکان پتەو بێت.

لە هەندێك کات و حاڵەتدا موسڵمانانی گەڕەکێ یان شارێ یان لادێیەك کۆدەبنەوە لە مزگەوت یان لە دەرەوەی شار بۆ نوێژەکان، لە هەر ڕوداوێك لە ژیانی موسڵماناندا عیبادەت و پەرستشی تایبەت بەو ڕوداوەوە هەیە:

١- نوێژی (الإستخارة): هەر کاتێك موسڵمان ویستی کارێکی گرنگ بکات دوو ركات نوێژ دەکات، دەپاڕێتەوە لە خوای گەورە کە ڕێگای ڕاستی لەوکارەدا نیشان بدات، بۆ خێری دین و ژیان و سەرەنجامی دوارۆژی، هەروەها دووری بخاتەوە لە خراپەکانی دنیا و دوارۆژ و هەرشتێ زیانی بۆ دینەکەی هەبێت.

* پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر کاتێك یەکێك لە ئێوە ویستی کارێکی گرنگ بکات دوو رکات نوێژی سوننەت بکات و پاشان ئەم دوعایە بخوێنێت: (اللّهُمَّ إنِّي أَسْتَخيرُكَ بعلمكَ، وأستَقدِرُكَ بِقُدرَتكَ، وَأسْأَلُكَ مِنْ فَضلكَ العَظيم، فَإنَّكَ تَقدِرُ وَلاَ أقدِر، وَتَعْلَم وَلاَ أَعْلَم، وَأَنتَ علام الغُيُوب، أللّهُمَ إنْ كُنْتَ تَعْلَمُ انَّ هذا لاَمْرَ(ناوی کارەکە ببات) خَيرٌ لى فى دِيني و مَعَاشي وَعَاقبَةَ أَمْري، وعاجلَهُ و آجلَهُ، فَأقدِرهُ لَي وَيَسِّرهُ لِي، ثُمَّ بارِكْ لِي فيه، وَإنْ كُنتَ تَعْلَمُ إنَّ هَذا الأَمْرَ شَرٌ لي في دِيني وَمَعاشي وَعَاقِبةَ أَمْري، وَ عَاجِلُهُ وَ آجلُهُ، فَأصرِفْهُ عَنّي وَأَصرِفْني عَنْهُ، وَأَقْدِر لى الخَيْرَ حَيْثُ كَانَ، ثُمَّ رَضني بِهِ[1].

* جابر (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ فێری نوێژی ئیستیخارەی دەکردین وەك چۆن فێری سورەتێکی قورئانی دەکردین[2]..

٢- نوێژی مردوو (الصلاة الجنازة): نوێژی مردوو فەرزی کیفایەیە واتە ئەگەر هەندێك لە موسڵمانان پێی هەستان ئەوا لەسەر باقی موسوڵمانانی تر دەکەوێ و پێی گوناهبار نابن، وا چاکە بە سێ ریز بکرێ. نوێژەکە بە پێوە دەکرێ، ئەگەر مردووەکە پیاو بوو ئیمام لای سەریەوە رادەوەستێ، ئەگەر ئافرەت بوو ئاوا لە ناوەراستییەوە دەوەستێت، چوار (الله اکبر) دەکرێت لە یەکەمدا سورەتی فاتیحە دەخوێنرێ یان سورەتێکی تریش لە

---

(١) أخرجه البخاري: (١١٦٢).

(٢) أخرجه البخاري: (١١٦٢).

گەلیدا، پاشان(الله اکبر)ی دووەم دەکریێ و سلاوات دەدریێ لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ، پاشان (الله اکبر)ی سێیەم دەکریێ و دوعای خێر دەکریێ بۆ مردووەکە (اللهم اغفر له و ارحمه).. هەروەها، پاشان(الله اکبر)ی چوارەم دەکریێ و دوعای خێر دەکەن بۆ خۆیان و بۆ مردووەکە و بۆ موسڵمانان بەگشتی (اللهم لا تحرمنا أجرة ولا تفتنا بعده، واغفر لنا وللمسمين أجمعين)، ئینجا سلاو دەدەنەوە.

کاتێك موسڵمانێك دەمرێت سەیر دەکەی دۆست و خۆشەویستەکانی و ئەوانەی ئەهلی خێر و چاکەن دەچن بەدەمیەوە دەیشۆن و نوێژی لەسەر دەکەن بە کۆمەڵ، دوعای خێری بۆ دەکەن، دەیبەن بۆ گۆڕستان دەی نێژن، بەشداری چالاکانە دەکەن.. لە کاتێکدا ئەو بەندەیە زۆر پێویستی بە رەحم و بەزەیی پەروەردگاری هەیە ئەگەر چل پیاو نوێژی لەسەر بکەن هاوەڵیان بۆ خوا بڕیار نەدابێ، ئەوا خوای گەورە نوێژی ئەو چل کەسە دەکاتە تکا و شەفاعەت بۆی و سەرفراز دەبێت لە قیامەتدا!.

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (مامِن مُسْلِمٍ يَمُوتُ، فَيَقُومُ عَلَى جَنَازَتِه أَرْبَعُونَ رَجُلاً، لايُشرِكُونَ باللهِ شَيْئاً إلا شُفِعوا فِيه)[1].

بێگومان ئەو کەسەی بەشداری بکات لە نوێژ کردن و چوون بۆ سەر گۆڕستان ئەوە خێرێکی زۆر زۆری بۆ دەنوسرێت.

* عن أبي هريرة رضي الله عنه قال قال رسول الله ﷺ: (من شهد الجنازة حتى يصلى عليها فله قيراط ومن شهدها حتى تدفن فله قيراطان قيل وما القيراطان قال مثل الجبلين العظيمين)[2].

٣- نوێژی جەژنی قوربان و رەمەزان (الصلاة العيدين): یەکی دوو رکات نوێژیان تێدا دەکرێت بە جەماعەت، بە بێ بانگ و قامەت پاشان ئیمام وتار دەخوێنێتەوە بۆ نوێژخوێنان، سوننەتە لەدەشت و دەر و قەراخ شاردا بکرێت، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەردوو جەژنەکەدا دەردەچوو لە شار[3].

---

(١) أخرجه مسلم: (٩٤٨).

(٢) أخرجه مسلم: (٩٤٥).

(٣) صحيح البخاري: (٩٥٦) (٩١٣)، ومسلم: (٨٨٩/٩).

* سونەتە لە رکاتی یەکەمدا ئیمام سورەتی (الاعلی) بخوێنێ، لە رکاتی دووەمدا سورەتی (الغاشیة)[1].

* سوننەتە چەند دەنکە خورمایەك بخورێ لە پێش چوون بۆ نوێژی جەژنی رەمەزان، بەلاّم بۆ جەژنی قوربان سوننەتە لەدوای نوێژ لە گۆشتی قوربانی بخورێت.

هەروەها سوننەتە موسلّمانان جل و بەرگی خاوێن و جوان لەبەربکەن و بۆنی خۆش لە خۆیان بدەن کە رۆشتن بۆ نوێژ.

* أبي سعيد الخدري قال: كان رسول الله ﷺ يخرج يوم الفطر والأضحى إلى المصلى فأول شيء يبدأ به الصلاة ثم ينصرف فيقوم مقابل الناس والناس جلوس على صفوفهم فيعظهم ويوصيهم ويأمرهم فإن كان يريد أن يقطع بعثا قطعه أو يأمر بشيء أمر به ثم ينصرف)[2].

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خوای لێ بێ) فەرموی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە رۆژی جەژنی رەمەزان یان قورباندا دەردەچوو بۆ جێگای نوێژکردن، یەکەم شتێ دەیکرد دوو رکات نوێژ بوو، پاشان رووی دەکردە خەلکەکە.. خەلکەکەش ریز ریز لە شوێنی خۆیان دادەنیشتن، ئامۆژگاری دەکردن و وتاری نوێژی جەژنی بۆ دەخوێندنەوە و فەرمانی دەردەکرد، ئەگەر بیویستایە کارێك بکەن هەر لەو شۆێنەدا فەرمانی دەکرد بەو کارە، یان ئەگەر بیویستایە چەند سەربازێك رەوانە بکات بۆ بەرەکانی تێکۆشان و سەنگەرگرتن هەر لەو شوێنەدا دەیناردن، پاشان بلاّوەیان لێ دەکرد!. ئەبو سەعید (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خەلّك بەردەوام بەو شێوەیە بوون..

بەلاّم بەداخەوە ئێستا خەلّکی جەژنەکانیان کردووە بە ئاهەنگ گێڕان، بە تایبەتی ئافرەتان خۆیان بەجل و بەرگی ناشەرعی دەڕازێننەوە و بە تێکەلاّوی ناشەرعی هەر وەکو ئاهەنگ و بۆنەکانی تر کاتەکە بەسەر دەبەن بەگۆرانی وتن و مۆسیقا لێدان و گالّتەو گەپ بەدوور لە رۆحی جەژن و چۆنیەتی سوننەتەکانی!.

---

(١) رواه مسلم: (٨٨٧/٧).

(٢) أخرجه البخاري: (٩٥٦) ومسلم: (٨٨٥).

٤- نوێژە بارانە (الإستسقاء): هەروەها لەکاتی وشکەساڵی و بێ بارانیدا، کاتێك ژیانی گیاندار و ئاژەڵەکان دەکەوێتە مەترسییەوە، موسڵمانان کۆدەبنەوە و دوو رکات نوێژە بارانە دەکەن و دەپاڕێنەوە لە پەروەردگار بارانی رەحمەتیان بۆ ببارێنێ و رزگاریان بکات..

* عوبادەی کوڕی تەمیم (رەزای خوای لێ بێ) لە مامیەوە گێڕایەوە و فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ دەردەچوو بۆ جێگای نوێژەکە و رووی دەکردە قیبلە و دوو رکات نوێژی دەکرد و کەواکەی بە هەڵەو گەڕاوەیی لەبەر دەکرد[1].

٥- نوێژی مانگ و خۆر گیران (الصلاة الخسوف و الكسوف): بە کۆی یەك دەنگی زانایان سوننەتێکی (المؤكدة)یە، موسڵمانان لەکاتی مانگ و خۆر گیراندا دوو رکات نوێژ دەکەن بە کۆمەڵ و لە خوا دەپاڕێنەوە بۆ بەردانیان.

* سوننەتە ئیمام لە پاش نوێژ وتار بخوێنێتەوە و هانی موسڵمانان بدات لەسەر کردەوەی چاکە و لە خوا ترسان و تەوبەکردن[2].

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (إن الشمس والقمر آيتان من آيات الله، وإنهما لا يخسفان لموت أحد، وإذا كان ذلك فصلوا وادعوا حتى يكشف ما بكم)[3]. واتە: مانگ و خۆر هەردووکیان نشانە گەلێکن لە بەڵگە و نیشانەکانی خوای پەروەردگار و دەسەڵاتە بێ سنوورەکەی، بۆ مردن و ژیانی کەس ناگیرێن، بەندەکانی پێ دەترسێنرێت، ئەگەر بینیتان خۆر یان مانگ گیراوە، نوێژ بکەن و بپاڕێنەوە لە خودا تا بەردەبن.

* لە ریوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (نوێژ بکەن و بپاڕێنەوە لە خوا و (الله اكبر) بکەن، خێر و چاکە بکەن)[4].

٦- نوێژی چێشتەنگاو: (الصلاة الضحى): یەکێکی تر لەو نوێژانە نوێژی چێشتەنگاوە لە دوو رکاتەوە سوننەتە تا هەشت رکات دوو رکات دەکرێت.

---

(١) أخرجه البخاري (١٠٢٦) ومسلم: (٨٩٤).

(٢) أخرجه البخاري: (٢/١٤٠٥)، و مسلم: (٢/٩١٠).

(٣) اخرجه البخاري عن أبي بكرة: (١٠٤٨).

(٤) أخرجه البخاري: (١٠٤٤). و مسلم: (٩٠٥).

* عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: ( أَوْصَانِي خَلِيلِي بِثَلَاثٍ لَا أَدَعُهُنَّ حَتَّى أَمُوتَ صَوْمِ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ وَصَلَاةِ الضُّحَى وَنَوْمٍ عَلَى وِتْرٍ)[1]. واته: ئەبو هوريرە (رەزای خوای لیّ بیّ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ ئامۆژگاری کردووم بە کردنی سیّ شت: سیّ ڕۆژ ڕۆژوو لە مانگێکدا، دوو ڕکات نوێژی چێشتەنگاو، نوێژی وەتریش بکەم پێش ئەوەی بخەوم.

* عَنْ أُمِّ هَانِئٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَلَّى فِي بَيْتِهَا عَامَ الْفَتْحِ ثَمَانِيَ رَكَعَاتٍ)[2]. پێغەمبەری خوا ﷺ لە ساڵی ڕزگارکردنی مەکەدا هەشت ڕکات نوێژی چێشتەنگاوی کردووە لە ماڵی ئوم هانیئدا (رەزای خوای لیّ بیّ).

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (لايُحافظُ عَلى الصَّلاة الضُحى إلاَّ أوّاب)[3]. واتە: پارێزگاری لە نوێژی چێشتەنگاو ناکات مەگەر کەسیّ نەبێت کە تەوبەکار بێت و زوو زوو بگەڕێتەوە بۆ لای خوا و پەشیمان بێتەوە لە گوناه.

* مرۆڤ (٣٦٠) جومگەی هەیە ئەگەر نوێژی چێشتەنگاوی کرد هەر جومگە و چاکەیەکی بۆ دەنوسرێت: (يُصْبِحُ عَلَى كُلِّ سُلَامَى مِنْ أَحَدِكُمْ صَدَقَةٌ فَكُلُّ تَسْبِيحَةٍ صَدَقَةٌ وَكُلُّ تَحْمِيدَةٍ صَدَقَةٌ وَكُلُّ تَهْلِيلَةٍ صَدَقَةٌ وَكُلُّ تَكْبِيرَةٍ صَدَقَةٌ وَأَمْرٌ بِالْمَعْرُوفِ صَدَقَةٌ وَنَهْيٌ عَنِ الْمُنْكَرِ صَدَقَةٌ وَيُجْزِئُ مِنْ ذَلِكَ رَكْعَتَانِ يَرْكَعُهُمَا مِنَ الضُّحَى)[4]. واتە: هەموو ڕۆژێك گشت جومگە و ئێسکێکی نادەمیزاد خێرێکی دەکەوێتە سەر هەموو (سبحان الله)یەك چاکەیەکە ، هەموو(الحمد لله)یەك چاکەیەکە، هەموو(لا اله الا الله)یەك چاکەیەکە، هەموو(الله اكبر)ێك خێر و چاکەیەکە،.فەرمان بە چاکە خێرێکە، قەدەغەکردنی خراپە چاکەیەکە، دوو ڕکات نوێژی چێشتەنگاو بە قەد ئەمانە هەموویان خێری هەیە.

٧- نوێژی پەشیمان بوونەوە لە تاوان و خراپەکاری: کاتێك بەندە تاوانێك یان خراپەیەك دەکات هەڵدەستیّ دەستنوێژ دەگریّ و نوێژ دەکات (أستغفرالله) دەکات و

---

(١) صحيح البخاري: (١١٧٨)، ومسلم: (٧٧٢).

(٢) صحيح مسلم: (١٧٠٠).

(٣) رواه الطبراني و ابن خزيمه وصححه الألباني في صحيح الترغيب و الترهيب: (٦٦٤).

(٤) صحيح مسلم: (١٧٠٤).

پەشیمان دەبێتەوە داوای لێ خۆشبوون لە خوای گەورە دەکات، خوای گەورەش لێی خۆشدەبێ بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیە: (ما مِن رَجُلٍ يُذنبُ ذنباً، ثمَّ يَقوم فيتَطهر، ثمَّ يُصَلِّي، ثُمَّ يَسْتَغْفِر الله، إلا غَفَر الله لَهُ، ثُمَّ قرأ هذه الآية: ﴿ وَالَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا فَاحِشَةً أَوْ ظَلَمُوا أَنفُسَهُمْ ذَكَرُوا اللَّهَ ﴾ آل عمران: ١٣٥ الى آخر الآية.[1]

٨- نوێژی تەسبیحات: ئەمەش یەکێکە لە نوێژە سوننەتە گەورەکان و خێرێکی زۆری هەیە، ئیمان پتەو دەکات هۆی لێ خۆشبوونی گوناه و تاوانە.

* پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی عەباس ئەی مامە گیان دە شتت فێر دەکەم ئەگەر ئەنجامیان بدەیت! خوای گەورە لە گوناهەکانی رابردوو و داهاتووت خۆش دەبێت، گوناهی کۆن و نوێ، هەڵە و قەستی، گەورە و بچوك، پەنهان و ئاشکرا، دە خەسڵەت؟ چوار رکات نوێژ بکە لە هەموو رکاتێکدا فاتیحە و سورەتێکی تر بخوێنە کە تەواو بوویت هەر بە پێوە پانزە جار لە دوای فاتیحەوە بڵێ: (سُبْحانَ اللهِ وَ الحَمْدُ للهِ وَلا إِلَهَ إلا اللهُ واللهُ أكبَر)، پاشان رکوع بەرەو دە جاری تر بیانڵێ، پاشان راست بەرەوە لە رکوع و دە جاری تر بیانڵێرەوە، ئینجا سەجدە بەرەو دە جاری تر بیانخوێنە، هەستەرەوە لە سەجدە لە نێوان دانیشتنی دوو سەجدەکەشدا دە جاری تر بیانڵێ، پاشان بچۆرەوە سەجدە و دە جاری تریش بیان خوێنە پاشان لە سەجدە سەر بەرزکەرەوە و دە جاری تریش بیانخوێنە، ئەمەش دەکاتە حەفتاو پێنج جار لە هەر رکاتێکدا، هەر چوار رکاتەکە بەو شێوەیە بکە، "ئەگەر گوناه و تاوانەکانت وەك کەفی دەریا یان بە قەدەر ژمارەی زیخ و چەو و لم بێت خوای گەورە لێت خۆش دەبێ"، ئەگەر دەتوانی هەموو رۆژێ یەك جار ئەو نوێژە بکە، ئەگەر ناتوانی هەفتەی جارێك، ئەگەر نەتتوانی مانگی جارێ، ئەگەر هەر نەتتوانی ساڵی جارێ ئەگەر هەر بۆت نەکرا لە هەموو تەمەنتدا جارێك ئەو نوێژە بکە)[2].

---

(١) أخرجه الترمذي وأبوداود وصححه الألباني في صحيح الترغيب و الترهيب: (٦٨٠).

(٢) أخرجه أبوداود وابن ماجه وصححه لغيره الألباني في صحيح الترغيب والترهيب: (٦٧٧)

**٩- نوێژی چوونه ناو مزگەوت (التحية المسجد): ئەم نوێژەش دوو ركاتە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت:** (إذا دخل أحدكم المسجد، فليركع ركعتين قبل أن يجلس)[١]. **واتە: هەر كەسێك لە ئێوە چووە ناو مزگەوت با دوو ركات نوێژ بكات پێش ئەوەی دابنیشێت.**

**١٠- دوو ركات نوێژی دوای دەستنوێژگرتن: سوننەتێكی(المؤكدة)یە :**

* عن أبي هريرة رضي الله عنه أن رسول الله ﷺ قال لبلال يا بلال حدثني بأرجى عمل عملته في الإسلام فإني سمعت دف نعليك بين يدي في الجنة. قال: ما عملت عملا أرجى عندي من أني لم أتطهر طهورا في ساعة من ليل أو نهار إلا صليت بذلك الطهور ما كتب لي أن أصلي)[٢]. **واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی بە بیلال ئەی بیلال! لە ئیسلامدا چ كردەوەیەكت كردووە، من گوێم لە دەنگی پێلاوەكانت بوو لە بەهەشتدا، بیلال وتی لەدوای هەموو دەستنوێژێ ئەو نوێژەی لەسەرم نوسراوە بەو دەستنوێژەوە كردوومە ئیتر شەو بێ یان رۆژ.**

**١١- نوێژی دوای تەوافی ماڵی خوا: سوننەتە دوو ركات بكرێ لە ركاتی یەكەمدا سورەتی فاتیحە و، ﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾بخوێنرێ، لە ركاتی دووەمیشدا سورەتی فاتیحە و، ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ بخوێنرێت.**

**ئیبن عومەر** (رەزای خوایان لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ حەوت جار بەدەوری ماڵی خوادا سوڕایەوە و لە دوای مەقامەوە دوو ركات نوێژی كرد**[٣].

**١٢- نوێژی تەراویح: سوننەتێكی (المؤكدة)یە، لە دوای نوێژی عیشای هەموو شەوێكی رەمەزان، دوو ركات دوو ركات بە كۆمەڵ دەكرێت.**

* عن أبي سلمة بن عبد الرحمن أنه سأل عائشة رضي الله عنها كيف كانت صلاة رسول الله ﷺ في رمضان فقالت : ما كان رسول الله ﷺ يزيد في رمضان ولا في غيره

---

(١) أخرجه البخاري: ٤٤٤، ومسلم: ٧١٤.

(٢) أخرجه البخاري:١١٤٩، ومسلم: ٢٤٥٨.

(٣) رواه البخاري: ٤٨٧/٣.

علی إحدی عشرة رکعة)[1] واته: ئەبی سەلەمە خو(رەزای ای لێ بێ) پرسیاری کرد لە عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) دەربارە نوێژی تەراویح؟ ئەویش فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە رەمەزان و جگە لە رەمەزانیش لە یازدە رکات زیاتری نەکردووە.

زۆربەی زانایان لەسەر ئەو رایەن کە جگە لە نوێژی وەتر بیست رکات نوێژی تەراویح بکرێت لە مزگەوتدا بە جەماعەت لەوانە پێشەوا شافیعی و ئیبن مبارك و سوفیان رەزاو رەحمەتی خوا بڕژێت بە سەریاندا.

پێشەوا کاسانی (بە رەحمەت بێ) دەڵێت: (عومەری کوڕی خەتاب (رەزای خوای لێ بێ) هاوەڵانی کۆکردەوە بیست رکات نوێژی تەراویحی پێکردن بە جەماعەت بێ ئەوەی هیچ کامیان بەرهەڵستی بکات ، ئەمەش یەك دەنگی هاوەڵان دەگەیەنێ)[2]

* عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ بەردەوام لە مزگەوتدا نەیکردووە، چونکە ترساوە لەوەی فەرز بکرێت لەسەر ئوممەتی.)[3]

* عَن أَبِی هُرَیْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللّٰه ﷺ قَالَ: (مَنْ قَامَ رَمَضَانَ إِیمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ)[4] واته: هەر کەسێك رەمەزان بە رۆژوو بێت بە ئیمانەوە شەو نوێژ و تەراویح بکات خوای گەورە لە گوناهی رابردووی خۆش دەبێت.

* هەروەها دەفەرموێت: (مَن قامَ مع الإمام حتی ینصرف کُتبَ له قیام اللیله)[5] واته: هەر کەسێك لەگەڵ ئیمامدا نوێژ بکات تا کۆتایی سوننەتی تەراویح ئەوە وەك ئەوە وایە تا بەیانی شەو نوێژی کردبێت.

(١) قال الألباني صحيح في سنن أبي داود: ١٣٤١، جامع الترمذي: ٤٣٩.

(٢) صحيح فقه السنة: أبو مالك سيد كمال ١/٤٣٧.

(٣) البخاري: (٩١٢٩)، ومسلم: (٧٦١).

(٤) البخاري: (٢٠١٤)، و مسلم: (٧٩٥).

(٥) صحيح أخرجه أبو داود: (١٣٧٥)، والترمذي: (٨٦٠)، والنسائي: (٣/٨٣).

# نـهێنـی دووبـاره بوونـهوەی نـوێژ

خوای گەورە نوێژی فەرزکردووە لەسەر موسوڵمانان لە شەوو ڕۆژێکدا پێنج جار، دەبێ لەکاتی دیاری کراوی خۆیاندا ئەنجام بدرێن، لە ئێواران و بە یانیان و عیشا و نیوەڕوان.. نوێژەکان دووبارە دەبنەوە بۆ ئەوەی ببنە گەرماوێکی ڕۆحی بۆ پاك بوونەوەی موسوڵمانان لە تاوان و گوناه.

*پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (أَرَأَيْتَ لَوْ أَنَّ رَجُلاً كانَ يعْتَمِلُ، وكان بَيْنَ مَنْزِله وَبَيْنَ مُعْتَمَله خَمْسَةُ أَنْهار، فَإِذا آتى مُعْتَمله عَمِلَ فيها مَاشَاءَ الله، فَأَصابَهُ الوَسَخ اَو العَرَق، فَكُلَّما مرَّ بنَهْرٍ أُغسلَ، ما كان ذلكَ يُبْقي من دَرَنه ؟ فَذالكَ الصلاة، كُلَّما عَمِلَ خَطيئةً فَدعَا وَاسْتغفر، غُفِر لَهُ مَا كَانَ قبلَها)[1]. واتە: ئەگەر کەسێك لە ئێوە لە شوێنێك کار بکات، نێوان ماڵەکەی و شوێنی کارەکەی پێنچ  ڕووباری تێدا بێت، لە شوێنی کارەکەی تاخوا ویستی لێ بێت کار بکات ئارەقاوی و چڵکن دەبێ، کاتێك گەڕایەوە بۆ ماڵ لە هەر پێنج ڕووبارەکە خۆی پاك پاك بشوات ئایا چڵکی پێوە دەمێنێ؟ دەی نوێژەکانیش ئاوەهان نوێژخوێن پاك دەکەنەوە لە گوناهو تاوان، هەر کاتێك نوێژخوێن تاوانی کرد و پەشیمان بویەوە و داوای لێ خۆشبوونی کرد لە خوای گەورە و پاڕایەوە، خوای گەورە لە تاوانی ڕابردووی خۆش دەبێ. دەی کەس هەیە لەشەو و ڕۆژێکدا تاوان نەکات؟!.

خوای گەورە ئەم ئادەمیزادەی زۆر سەر سوڕهێنەر بەدیهێناوە، یان ئەوەتا بەکردەوەی چاك بەرەو ژیانی ڕۆحی و ملائیکە دەچێ، یان بە کردەوەی ناپەسەند بەرەو لای شەیتان و ئارەزووە ئاژەڵیەکان دەڕوات، ئەوە ئەنگی و عەیبە نیە کە تاوان و هەڵە بکات، بەڵکو ئەوە خراپە بەردەوامبێ لەسەر تاوان و تەوبە نەکاو  پەشیمان نەبێتەوە، چونکە هەموو مرۆڤێك هەڵە دەکات بەڵام چاکترینیان ئەوەیە بگەڕێتەوە و بەردەوام نەبێت. بەڵام ئەگەر هەر بەردەوام بوو لەسەر خراپەکاری ئەوە ئیتر دەچێتە ڕیزی ئاژەڵان و بگرە خراپتریش لە ئاژەڵە دڕندەکان.

---

(١)رواه الطبراني في الاوسط والكبير وصححه لغيره الألباني في صحيح الترغيب والترهيب:(٣٥٥)

ئەنجامدانی ئەو نوێژانە فرسەتن بۆ گەڕانەوە لەتاوان و هاتنەوە سەر ڕێگای ڕاست، هۆی گەڕانەوەن بۆلای پەروەردگار، دەبنە هۆی کوژانەوەی ئاگری تاوانی ئارەزووە ئاژەڵیەکان، زیکر و یاد و بیرخەرەوەی ژیانی قیامەتن.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ وَاشْكُرُوا لِي وَلَا تَكْفُرُونِ ﴾ البقرة: ١٥٢. واتە: زیکر و یادی من بکەن .منیش یادی ئێوە دەکەم..

هەروەها دەفەرموێت:﴿ أَلَا بِذِكْرِ اللَّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ ﴾ الرعد: ٢٨. واتە: تەنها بە زیکر و یادی خوا دڵەکان ئارام دەبن و دەحەوێنەوە.

* پیاوێك وتی بە سەلمان چ کردەوەیەك گەورەیە؟ فەرمووی: ئەی قورئانت نەخوێندووە کە دەفەرمێت:﴿ وَلَذِكْرُ اللَّهِ أَكْبَرُ ﴾العنكبوت: ٤٥.

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (مَثَلُ الَّذي يَذكُرُ ربَّهُ والَّذى لايَذكر ربَّه مَثَلُ الحَيِّ والمَيِّت)[1]. واتە: وێنەی ئەو کەسەی یادی خوا دەکات، ئەوەی نایکات وەك زیندو و مردو وایە.

مەکحول دەڵێت: باسکردن و یادی خوا شیفایە بۆ دڵ و دەروون بەڵام باسکردنی خەڵك دەرد و بەڵایە!.

ئیبن قەیم (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: نوێژ بۆ زیکر و یادی خوایە ، زیکریش قوتی دڵ و ڕۆحە ، بێگومان چۆن جەستە پێویستی بە خواردن و خوادنەوە هەیە دڵیش ئاوەها پێویستی بە یادی خوا و پەرستشەکانی تر هەیە، یادی خوا هۆی هەڵهاتن و پشت شکاندنی شەیتانە، هۆی ڕەزامەندی پەروەردگارە، غەم و پەژارە لە دڵ دەردەکا، خۆشی و شادی دەخاتە دڵەوە، هۆی درەوشانەوەی دڵ و ڕووخسارە، بەدەست هێنانی تەقوا و خۆشەویستی خودایە، گەڕانەوەیە بۆ لای خوا"[2].

ئیبن تەیمیە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: زیکر و یادی خوا بۆ دڵ وەك ئاوە بۆ ماسی، دەبێت حاڵی ماسی چۆن بێت ئەگەر ئاوی لێ ببڕێت؟!.

---

(١) أخرجه البخاري: (١١/٢٠٨) ومسلم: (١/٥٣٩).

(٢) وابل الصيب من الكلم الطيب لإبن القيم.

پیاوێك وتی بە حەسەن (ڕەحمەتی خوای لێ بێ): شکاتی دڵ ڕەقی خۆم لای تۆ دەکەم؟ حەسەن فەرمووی: بە زیکر و یادی خودا بیتوێنەرەوە و نەرمی بکە.

دووبارە بوونەوەی نوێژەکان دەبێتە هۆی کوژاندنەوەی ئاگری تاوان، پێغەمبەری خوا پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (إنَّ للهِ مَلَكاً يُنادي عِنْدَ كُلِّ الصلاة: يابني آدم! قوموا إلى نيرانيكُم الَّتي أَوْقَد تُمُوها فَأَطفيؤُهَا)(١). هەموو نوێژێك لە نوێژە فەرزەکان ملائیکەیەك بانگ دەکات و دەڵێت: ئەی نەوەی ئادەم هەستن بچن بەدەم ئەو ئاگرەوە کە هەڵتان گیرساندوە و بەرتان داوەتە جەستەی خۆتان بی کوژێننەوە.. بەڵێ ئاگرێکی بەتین و سوتێنەرە دەبێ بیکوژێننەوە ئەگینا گڕەکەی دەگاتە دڵ و دەروونتان. بەڵێ نوێژ ئاگرکوژێنەوەیە، گڕی ئاگرەکە ناهێڵێ و، ڕەشاییەکەشی لادەبات. مەبەست لێرەدا شۆردنەوەی گوناه و تاوانە!.

نوێژ بە تەنها بۆ ئەوە نییە تاوان بسڕێتەوە و بەس، بەڵکو چەندەها حیکمەت و ئامۆژگاری گرنگی تری تێدایە، نوێژ ئەو کردەوە موبارەکەیە موسڵمان لەشەو و ڕۆژێکدا بەلای کەمەوە پێنج جار پەیوەندی ڕاستەوخۆ بەبێ تەرجومان دەکات بە پەروەردگاریەوە، میعراجە بۆی، توێشوو و خواردنی ڕۆژانەی ڕۆحیەتی، وەك چۆن گەدە لە ڕۆژێکدا چەند جار تێر دەکرێ پێویستی بە خواردن و خواردنەوە هەیە، بەوجۆرە ڕۆحیش پێویستە تێر بکرێ، ئەو زیکر و یادی خوایە کە دەکرێ لە نوێژدا شەحن کەرەوەی ڕۆحە، دڵ ڕووناك دەکات، سنگ فراوان دەکا، چونکە نوێژخوێن لە زەوی دادەبڕێت بەرەو ئاسمان، بەرەو قاپی ڕەحم و بەزەیی پەروەردگار، لە بەردەمی پەروەردگاریدا بەبێ پەردە رادەوستێ و گفت و گۆی لەگەڵ دەکات، هاواری لێ دەکا و لێی دەپاڕێتەوە، لە یەکێکی دوور ناپاڕێتەوە لە بیسەر و بینەری نزیك لە بەندەوە دەپاڕێتەوە، هانا بۆلای خاوەن دەسەڵاتێکی گەورە دەبا، هاواری بۆلای دەوڵەمەندێکی لە رادە بەدەر و خاوەن سۆز و بەزەیی دەبات، بەو شێوەیە شیفای روحی دەدات و نەفسی پاك دەکاتەوە..

---

(١) أخرجه الطبراني في الاوسط والصغير والالباني في صحيح الترغيب و الترهيب: (٣٥٨).

* خوای گەورە لە فەرموودەی قودسیدا دەفەرموێت: (نوێژم دابەش کردووە لە نێوان خۆم و بەندەکەمدا ئەوەی بەندەکەم داوای دەکات پێی دەبەخشم.. کاتێك بەندە دەڵێت: ﴿اَلْحَمْدُ لله رَبِ الْعَالَمِينَ﴾ سوپاس و ستایش بۆ خوای خاوەنی هەموو جیهانیان و بوونەوەر، هەست دەکات کە پەروەردگار سەرنجی مەلائیکەکانی بۆ لای رادەکێشێت و دەفەرموێت: سەیرکەن بەندەکەم سوپاس و ستایشی کردم و بەندەیەکی بەوەفایە.. کاتێك بەندە دەڵێت: ﴿اَلرَّحْمنِ الرَّحِيمِ﴾ بەخشندەو میهرەبانە ئەوخوایەی کانگای رەحمەت و سۆز و بەزەییە، خوای گەورەش دەفەرموێت: سەیرکەن بەندەکەم مەدح و سەنای کردم..کاتێك دەڵێت: ﴿مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ﴾ خاوەن و سەرداری رۆژی قیامەت، دەفەرموێت: سەرنج بدەن ئەوەتە بەندەکەم بە خاوەن دەسەڵات و شکۆمەندم دەزانێت.. کاتێك دەڵێت: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ خاوەن و سەرداری رۆژی قیامەت، دەفەرموێت: سەرنج بدەن ئەوەتە بەندەکەم بە خاوەن دەسەڵات و شکۆمەندم دەزانێت.. کاتێك دەڵێت: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ خودایە عیبادەت هەر بۆ تۆ دەکەم، داوای کۆمەکی هەر لە تۆ دەکەم، پشت و پەنام هەر تۆی، خوای گەورە دەفەرموێت: بەندەکەم راست دەکات ئەوەتە بە کردار و بەگوفتار هەر من دەپەرستێت و هەر منیش بە پشتیوان دەزانێت.. تا ئێرە نێوان من و بەندەکەم بوو، بۆ بەندەکەم هەیە داوا بکات، کاتێك دەڵێ: ﴿إِهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِمَ * صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِم غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِم وَلاَ الضَّآلِّينَ﴾. دەفەرمووی ئەمە بۆ بەندەکەمە، ئەوەی داوای کرد پێی دەبەخشم[1].

عیبادەت و بەندایەتی بۆ خوا و، هاوەڵ و شەریك بۆ دانەنانی، کردەوەی چاکە ژیانێکی پڕ لە خۆشی و کامەرانی لە دنیا و قیامەتدا فەراهەم دەهێنن بۆ موسڵمان، نە ترسی لە کەس دەبێ و نە غەم و پەژارە.. ئەگەر مرۆڤ بەو جۆرە بوو بەندەی خوا بوو بەڕاستی سەربەرزانە دەژی و لەکەس ناترسێ و خەفەتی نیە، لە کاتێکدا خەڵك زەلیل و ژێر دەستەی ئەم و ئەون و سەریان دانەواندووە بۆیان، بەڵام موسڵمان سەر بۆ هیچ کەسێك دانانەوێنێ جگە لە خودا، کە ئەوەش خۆی بۆ خۆی بەهەشتێکە تێیدا دەژی

(١) أخراجه مسلم في الصلاة: (٣٩٥)، وأبو داود في الصلاة: (١٣٢) والترمذي: في التفسير (١).

﴿ مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾ النحل: ٩٧.

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (إِنَّ الرَّجُلَ إذا دَخَلَ فِي صَلَاتِهِ أَقْبَلَ اللهُ عَلَيهِ بِوجْهِ، فَلَايَنْصَرِفُ عَنْهُ، حتى يَنْقَلِبَ)[1]. واته: کاتێك پیاو دەچێتە نوێژەوە خوای گەورە بەردەوام رووی رەحمەت و بەزەیی تێدەکاو، رووی لێ وەرناگێرێ تا لە نوێژەکەی دەبێتەوە و، دەگەرێتەوە بۆ شوێنی پێش نوێژ کردنەکە..

* پێغەمبەری خوا دەفەرموێت: (إذا قرأ ابن آدم السجدة، اعتزل الشيطان يبكي، يقول: يا ويله، أمر بالسجود فسجد، فله الجنة، وأمرت بالسجود فعصيت، فلي النار)[2]. واته: کاتێك ئەوەی ئادەم دەچێتە سەجدەوە شەیتان کەنار دەگرێت و دەست دەکات بە گریان دەڵێ: هاوار و واوەیلا بۆ من ئەو موسڵمانە فەرمانی پێکراوە سەجدە بەرێت، سەجدە دەبات و دەچێتە بەهەشتەوە، بەڵام من نافەرمانی خودام کرد سەجدەم نەبرد دۆزەخ جێگامە.

نوێژ پاك و خاوێنییە پاك و خاوێنی دڵ و دەروون، پاك و خاوێنی لەش و جل و بەرگ، بەڵکو ئەو شوێنەش کە نوێژەکەی تێدا دەکرێ..

دەستنوێژ گرتن و خۆشتن لەکاتی لەش گرانیدا واجب و پێویستن بۆ نوێژ کردن کە ئەوەش مانای پاك و خاوێنی دەگەیەنێت، نوێژ کلیلی بەهەشتە و، کلیلی نوێژیش پاك و خاوێنی و خۆ پاك کردنەوەیە. هەروەها پاك و خاوێنی لە باوەرەوەیە.

هەروەها نوێژ کردن وەرزشە بۆ جەستە، ماسولکەکان بەهێز دەکات و چوست و چالاك دەبن، بەتایبەتی نوێژی بەیانیان و ئەو نوێژانەش کە پێش وەخت خۆیان بۆ ئامادە دەکرێت.. لە دەستنوێژ گرتنەوە تا دەگاتە چوون بۆ مزگەوت و گەرانەوە و هەستان و دانیشتنی ناو نوێژەکان، ئەمانە هەر هەموویان جەستە بەهێز و چالاك و تەندروست دەکەن.. بەو شێوەیە نوێژ برتییە لە جووڵە و ئیشکردن، هەموو لایەنەکانی جەستە

(١) أخرجه الترمذي وصححه الألباني في صحيح الترغيب و الترهيب: (٥٥٢).

(٢) رواه مسلم في صحيحه: (١٣٣).

دەگرێتەوە، جەستە رێك رادەوەستێ، ركوع و سەجدە دەبرێ، زمان قورئان و زیكر و دوعا دەخوێنێ (الله اكبر) دەكا، عەقڵ تێدەفكرێ، دڵ ئامادەیە و ترس و خۆشەویستی بۆ خوا هەیە، خوای گەورەی كردووە بە چاودێر بەسەر خۆیەوە، بە شەوق و زەوقەوە پێشوازی لە نوێژەكەی دەكات.

زانای گەورە و پایە بەرزی كورد مامۆستا سەعیدی نوورسی زۆر گرنگی دەدا بە نوێژەكانی لە یەكێ لەوتەكانیدا دەفەرموێ: ئەی نەفسەكەم بزانە كە دوێنێ رۆشت و لە دەست دەرچوو، سبەینێش هێشتا نەهاتووە و هیچ بەڵێن و پەیمانێكیشت نەدراوەتێ كە تۆ سبەینێت هەیە و دەمێنی تا ببینی، كەواتە تەنها ئەمرۆ بە تەمەنی راستەقینەی خۆت بزانە، كەمترین شتێكیش كە لە ئەمرۆدا بتوانی بیخەیتە ناو سندوقی پاشەكەوت كردنی دوا رۆژتەوە، تەنها یەك سەعاتە كە لە مزگەوت یان لەسەر بەرماڵ بەسەری بەریت، تاكو دوا رۆژی راستەقینە و هەمیشەیی خۆتی پێ دابین بكەی.

پێشەوا عەلی كوڕی ئەبی تالب فەرمویەتی: بەندەی ئیماندار كاتێك رۆحی دەرچوو جێگە نوێژەكەی و ئەو مەلائیكەیەی كردەوە چاكەكانی بۆ بەرز دەكاتەوە بۆی دەگرین. پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿فَمَا بَكَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلسَّمَآءُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَا كَانُواْ مُنظَرِينَ﴾ الدخان: ٢٩ (١).

---

(١) إحياء علوم الدين لإمام الغزالي (رحمه الله): (١/٣٥١).

# نوێژ كەفارەتی تاوان و كرداری ناپەسەندە

بێگومان نوێژ دەبێتە هۆی كەفارەتی هەرچی كردار و گوفتاری ناپەسەندە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيۡلِۚ إِنَّ ٱلۡحَسَنَٰتِ يُذۡهِبۡنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ ذَٰلِكَ ذِكۡرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ﴾ هود: ١١٤ واتە: هەستە بە ئەركی ڕاگرتنی نوێژ لەهەر دوو سەری ڕۆژەوە و لە بەشێك لە شەویشدا، بەڕاستی كردەوە چاكەكان كردارە ناپەسەندەكانتان لادەبەن و دەبنە كەفارەت و شۆردنەوەی گوناهەكانتان، ئەوە ئامۆژگاری و بیرخەرەوەیە بۆ ئەوانەی زیكر و یادی خوا دەكەن.

*پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (الصَّلَواتُ الخَمسُ، والجُمْعَةُ إلى الجُمْعَة كَفَارَةٌ لمّا بَيْنَهَا، مَالَم تَغْشَ الكَبائر)(١) واتە: پێنج فەرزەی نوێژ و، نوێژی جومعە تاجومعەیەكی تر، دەبنە هۆی شۆردنەوەی خراپە و تاوانی نێوانیان، بەمەرجێ لە تاوانە گەورەكان نەبن.

*هەروەها دەفەرموێت: أَرأَيتُم لَوْ أَنَّ نَهرًا بِبَابَ أَحَدكُمْ، يَغْتَسِلُ فِيه كُلَّ يَوْمٍ خَمْسًا، مَا تَقُولُ ذَلكَ يُبْقِي مِنْ دَرَنِه. قَالُوا لاَ يُبْقِي مِنْ دَرَنِهِ شَيْئًا. قَالَ: فَذَلكَ مِثْلُ الصَّلَوَات الخَمْسِ، يَمْحُو اللَّهُ بِهَا الخَطَايَا »(٢) واتە: ئەگەر ڕووبارێ بە بەردەمی ماڵی یەكێك لە ئێوەدا بڕوات ڕۆژی پێنج جار خۆی پاك بشوات، ئایا چڵكی پێوە دەمێنێت؟. وتیان: نەخێر هیچ چڵكی پێوە نامێنێ. فەرمووی: دەی ئەوە وەك پێنج فەرزەی نوێژ وەهایە، خوای گەورە گوناه و خراپەكانتانی پێ دەشواتەوە.

عەبدوڵای كوڕی مەسعود (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (تَحْتَرِقُون تَحْتَرِقُونَ، فإذا صَلّيتم الصُّبحَ غَسَلَتْها، ثُمَّ تحترقون تحترقون فإذا صَلّيْتُم الظُّهرَ غَسَلَتْها، ثُمَّ تَحْتَرقون تَحْتَرِقُونَ، فإذا صَلَّيتم العَصْرَ غَسَلَتْها، ثم تَحْتَرِقُون تَحْتَرِقُون فإذا صَلّيتم المَغْرِبَ غسَلتها، ثم تَحْتَرِقُون تَحْتَرِقُون، فإذا صَلّيتم العشاء غَسَلَتْها، ثُمَّ

---

(١) أخرجه مسلم: (٢٣٣).

(٢) أخرجه البخاري: (٥٢٨)، ومسلم: (٦٦٧). تحفة ١٤٩٩٨

تنامُون، فَلا يُكْتِب عَلَيْكُم حَتّى تَسْتَيقِضُوا) [1].واتە: گرتان تێ بەردەبێ و دەسوتێن ئەگەر هەستان نوێژی بەیانیتان کرد ئەوە ئاوتان پێدا کردوە و کوژاندوتانەتەوە، تاوانەکانتان پێ شۆردووەتەوە، بەو جۆرە نوێژەکان تا دەگاتە نوێژی عیشا یەك لە دوای یەك دەبنە هۆی شۆردنەوەی گوناه و تاوانەکانتان، کە خەوتیشن هیچ گوناه و تاوانتان بۆ نانوسرێت تا لە خەو بەخەبەر دێنەوە و دەست دەکەنەوە بە کاری ناپەسەند سەرلەنوێ.

* سەلمانی فارسی (رەزای خوای لێ بێ) گێڕایەوە و فەرمووی: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە ژێر درەختێکدا بوین لقێکی وشکی راوەشاند هەرچی گەڵای پێوە بوو هەڵوەری فەرمووی: ئەی سەلمان! بۆچی پرسیارت نەکرد بۆ وام کرد؟ وتم: ئەی پێغەمبەری خوا! بۆچی وات کرد؟ فەرمووی: (إنَّ مُسْلم إذا تَوضَأ فأحْسِن، ثُمَّ صَلّى الصّلوات الخَمْس، تَحاتَّت خطاياهُ كماتَحاتُّ هذا الوَرَق وَقَالَ﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيۡلِۚ إِنَّ ٱلۡحَسَنَٰتِ يُذۡهِبۡنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ ذَٰلِكَ ذِكۡرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ﴾ هود: ١١٤ [2]. واتە: ئەگەر موسوڵمان دەستنوێژی گرت بە چاکی، پاشان پێنج فەرزەی نوێژی کرد، گوناهەکانی هەڵدەوەرێت وەك گەڵای ئەو درەختە. پاشان فەرمووی: خوای گەورەش دەفەرموێت: نوێژ بە چاکی ئەنجام بدە لەهەر دووسەری رۆژەوە و لە بەشێك لە شەویشدا، بەراستی کردەوە چاکەکان خراپەکان لادەبەن و گوناهەکان دەشۆنەوە، ئەوە ئامۆژگاری و بیر خەرەوەیە بۆ ئەوانەی زیکر و یادی خوا دەکەن و پەند وەردەگرن.

* عوسمانی کوڕی عەففان (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (مَامِنْ أمْرِئ مُسْلِمِ تَحْضُرُهُ الصلاةُ المَكْتُوبَةَ، فَيُحْسِنُ وَضُوءَهَا و خُشُوعَهَا و رُكُوعَهَا، إلاَّ كَانَتْ كَفَارةً لِمَا قَبْلَها مِنَ الذُنُوب، مَالَم تُوتَ كَبيرةٌ وذلك الدّهر كلّهُ) [3].
واتە: هەر موسوڵمانێك ئامادەی پێنج فەرزەی نوێژ بێت، بە رێك و پێکی و بە جوانی دەست نوێژی بۆ بگرێ و بە خشوعەوە بەجێیان بێنێ، رکوعەکەشی تەواو بێت، دەبێتە هۆی

(١) رواه الطبراني في الصغير)وقال الألباني حسن صحيح في الصحيح الترغيب و الترغيب: (٣٥٧)
(٢) أخرجه أحمد والنسائي وحسنه لغيره الألباني في الصحيح الترغيب و الترغيب: (٣٦٣).
(٣) أخرجه مسلم (٢٢٨).

کەفارەتی گوناهەکانی رابردووی، بە مەرجێ لە گوناهە گەورەکان نەبن، ئەمەش بۆ هەموو تەمەنیەتی.

* ئەبو ئەیوبی ئەنصاری (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (إِنَّ لِكُلِّ صَلَاةٍ تَحطُّ مَابَيْنَ يَدَيْهَا مِن خَطِيئة)[1]. واتە: هەموو نوێژێك گوناهەکانی پێش خۆی دەشواتەوە.

* ئیبن عومەر (رەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (إِنَّ العَبْدَ إِذا قَامَ إلى الصَلاَة أُتِي بِذُنُوبِهِ كُلِّها، فَوَضَعَتْ عَلَى عَاتِقه، فَكُلَّما رَكَعَ أو سَجَدَ، تَسَا قَطَت عَنْهُ)[2]. واتە: کاتێك بەندەیەکی خوا هەستا بۆ نوێژکردن هەموو گوناه و تاوانەکانی دەخاتە سەرشانی و کاتێك رکوع یان سەجدە دەبات دەکەونە خوارەوە لەسەر شانی و لەکۆڵی دەبنەوە.

* رەبیعەی کوڕی کەعب (رەزای خوای لێ بێ) گێڕایەوە فەرمووی: شەوێك لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووم پێویستی دەست نوێژم بۆ ئامادەکرد. فەرمووی: بۆداوای شتێکم لێ ناکەیت. وتم: داوات لێ دەکەم کە هاوڕێت بم لە بەهەشتدا. فەرمووی: جگە لەوە داوا بکە؟. وتم: هەر داوای ئەوەت لێ دەکەم. فەرمووی: (فَأَعِنِّي عَلَى نَفْسِكَ بِكَثْرَةِ السُّجُودِ)[3]. دەی زۆر سەجدە بەرە بۆ خودا واتە نوێژی زۆر بکە.

* أبو ذر (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (کاتی وەرزی زستان بوو گەڵای درەختەکان دەوەرین پێغەمبەری خوا ﷺ چەند لقە دارێکی گرت و رای وەشاندن گەڵاکانیان هەڵوەری فەرمووی: ئەی ئەبا زەڕ! وتم: فەرمان بەردارتم و گوێرایەڵی تۆم ئەی پێغەمبەری خوا! فەرمووی: بەندەیەکی موسڵمان نوێژێك دەکات لەبەر رەزامەندی خوای گەورە، گوناه و تاوانەکانی هەڵدەوەرن هەر وەك چۆن بینیت گەڵای ئەم درەختە هەڵوەری)[4].

---

(١) أخرجه أحمد وقال الألباني حسن صحيح في صحيح الترغيب والترغيب: (٣٦٥).

(٢) أخرجه طبراني و البهقي و أبو نعيم في الحُليه و الألباني في الصحيحة: (١٣٩٨).

(٣) أخرجه مسلم: (٤٨٩) (١١٢٢).

(٤) صحيح الترغيب والترهيب: (٣٨٤).

* ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) گێڕایەوە و فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ دای بەلای گۆڕێکدا فەرمووی: خاوەنی ئەم گۆڕە کێیە؟ وتیان فلان کەسە. فەرمووی: دوو رکات نوێژ خۆشەویستترە بۆ ئەو لەو ژیانەی کە ئێوە لە دنیادا ماوتانە بەسەری بەرن)[1].

بەڵێ دوو رکات نوێژی دروست لە هەموو دنیا باشترە بۆ موسڵمان ئەگەر بە نییەتی پاکەوە بۆ ڕەزامەندی خوا ئەنجامی بدات.

* سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: دوو برای موسڵمان هەبوون یەکێکیان پێش ئەوی کەیان بە چل رۆژ وەفاتی کرد، منیش باسی چاکە و پیاوەتی یەکەمیانم کرد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (ئەی ئایا ئەوەی تریشیان موسڵمان نەبوو؟). وتم: بەڵێ ئەوی تریشیان موسڵمان بوو. فەرمووی: (ئێوە نازانن بەو چل رۆژەی لە دوای ئەو نوێژەکان ئەویشیان گەیاندووەتە چ پلەیەك؟ وێنەی نوێژەکان وەك چۆن جۆگەیەك بە بەردەم دەرگای یەکێ لە ئێوەدا بڕوات و بچێتە ناوی و دایپۆشێت، جا رۆژی پێنج جار خۆی فڕێ داتە ناوی و خۆی بشوات، چۆن دەی بینن؟ ئایا هیچ چلکی پێوە دەمێنێ؟ کەواتە ئێوە نازانن نوێژەکانی بەو چل رۆژە ئەوی گەیاندووەتە چ پلەیەکی بەرز و پڕ شکۆ)[2].

برای موسوڵمان جا ئیتر بە دوای چیدا دەگەڕێی لەمانە چاکتر و باشترت لە کوێ دەست دەکەوێت؟ نوێژەکانت ببێتە کەفارەتی کردار و گوفتارە ناپەسەندەکانت، بە زۆر سەجدە بردن دەگەیتە ئەو پلەیە لە بەهەشتدا هاوەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ بیت، دەی چ مژدەیەك لەوە خۆشترە بۆ نوێژخوێن؟ کام بەختەوەری و دڵنیاییەك لەوە چاکترە!!.

(١) أخرجه الطبراني في الأوسط، صحيح الترغيب و الترهيب: (٣٩١).

(٢) أخرجه مالك و أحمد باسناد حسن والنسائي، صحيح الترغيب و الترهيب: (٣٧١).

# نوێژ بەرگریکەری تاوانە

وەك لە پێش ئەم باسەدا روونمان کردەوە نوێژی راستەقینە دەبێتە هۆی سڕینەوەی تاوان و هەرچی کردار و گوفتاری ناپەسەندە، ئەگەر بە چاکی و بە خشوع و دڵ بێدارییەوە ئەنجام درا، لە کاتی خۆی دوا نەخرا، خاوەنەکەی بەردەوام بوو لە سەری بە شەوق و زەوق و چالاکییەوە، ئەگەر ئەو مەرجانەی تێدا رەچاو کرا، ئەوە لای خوا وەرگیراوە و ئاسەواری باشی دەبێ لەسەر خاوەنەکەی و دەبێتە هۆی قەدەغەکردنی لە تاوان و خراپە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ﴾ العنکبوت: ٤٥. واتە: هەستە بە ئەرکی راگرتنی نوێژ چونکە بەراستی نوێژ مرۆڤەکان قەدەغە دەکات لە هەرچی نارەوایی و شتی ناپەسەندە.

پێشەوا قورتوبی (رەحمەتی خوای لێ بێ) لە راڤەی ئەم ئایەتەدا دەڵێ: بۆیە دەبێ نوێژ مرۆڤ لە خراپە و بەدکاری دوور بخاتەوە چونکە قورئان خوێندنی تێدایە ئامۆژگاری مرۆڤ دەکا، جگە لەوە نوێژ هەموو گیانی نوێژ خوێن سەرگەرم دەکا..کاتێك دەچێتە میحرابی نوێژ و ملکەچ دەکا و بیردەکاتەوە لەبەردەم خوادایە، خوای گەورە ئاگای لێیەتی، بەم حاڵەتە دەروونی راست دەبێتەوە، لە ئەندامەکانیدا ئاسەواری چاودێری خوا بەسەریەوە دەردەکەوێ، بەو شێوەیە نوێژخوێن تا نوێژێکی تر ئەو حاڵەتە بەسەریدا زاڵە.. بە تایبەتی ئەگەر ئەو خەیاڵەش بکات کە لە هەر نوێژێکدا وا دابنێت کە دوایەمین نوێژیەتی و تەمەنی کۆتایی هاتووە.. بۆ وانەبێت؟ مەگەر موسڵمان دڵنیا نییە کە مردن کات و کەس و نەخۆشی ناناسێ؟! جا نوێژی ئاوا مرۆڤ دوور دەخاتەوە لە خراپە و بەدکاری و هەموو ناپەسەندییەك..

نوێژێك بە خشوعەوە بکرێ، خاوەنەکەی دوور دەخاتەوە لە تاوان و خراپەکاری، دەستی دەگرێ بۆلای خێر و چاکە، هەرلەبەر ئەوەشە کە دەبینی سەرەڕای ئەوەی هەندێ لە نوێژخوێنان کەموکوڕییان هەیە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر چاکترن لە خەڵکانی تر.

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (عَلَيْكُم بِقيامِ اللَّيلْ، فإِنَّهُ دَأْبُ الصَالِحينَ قَبْلَكُم، وَقُرْبَةٌ الى ربِّكُم وَمُنْهاةٌ عَنِ الإثمِ وَمَكْفَرَةٌ للسّيئات).[1] واتە: شەونوێژ بکەن و بەردەوام بن لەسەری بەگوێرەی توانا، چونکە ئاکار و رەوشتی پیاوچاکانی پێش ئێوە بووە، نزیك بوونەوەیە لە پەروەردگارتان، بەرهەڵستیکەری خراپە و تاوانە، هۆی کەفارەت و لێ خۆشبوونی کردەوە ناپەسەندەکانتانە.

پێغەمبەری خوا ﷺ روونی کردەوە کە شەو نوێژ بەرهەڵستی خراپە دەکات، خاوەنەکەی دەگێڕێتەوە لە گوناه و تاوان، فەرمانی پێ دەکات بە چاکە کردن، پێویستە ئێمەش نوێژی زۆر بکەین بە خشوعەوە، شەو نوێژ بکەین، لە بەردەم پەروەردگاردا بەزەلیلییەوە راوەستین، بە دڵ بگرین بۆ ئەو هەموو زیادەرەوەی و کەم و کورییانەی کە هەمانە، بە هیوای رەحمەت و سۆز و بەزەیی خوابین، تەوەسول تەنها بەو بکەین کە دامەزراومان بکات لەسەر دینەکەی، سوودمەند بین لە شەو نوێژ و نوێژەکانی تر، بەڵکو خوای گەورە بە سۆز و بەزەیی خۆی دڵ و دەروغان پاك بکاتەوە لە چڵکی گوناه و تاوان..

* بە پێغەمبەری خوایان ﷺ وت: فلانەکەس هەموو شەوێ بە درێژایی شەو نوێژ دەکات، کە رۆژی لێ بوویەوە دزی دەکات! فەرمووی: ئەگەر ئەوەی دەیڵێن راست بێ ئەوە ئەو شەونوێژەی بەرهەڵستی دزییەکەی لێ دەکات و واز لە دزیکردن دێنێت[2].

* ئەبو هوریرە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (إذا خَرَجْتَ مِنْ مَنْزِلكَ، فَصَلِّ رَكْعَتَين يُمانعَانَكَ مِن مَخْرَجِ السُّوء، وَإذَا دَخَلْتَ إلى مَنْزِلكَ، فَصَلِّ رَكْعَتَين يَمانَعانكَ مِنْ مَدْخَلِ السُّوء)[3]. واتە: کاتێك چویتە دەرەوە دوو رکات نوێژ بکە دەتپارێزێ لە خراپەی لەماڵ دەرچوون، کاتێك گەڕایتەوە و چوویتە ژوورەوە بۆ ناوماڵ دوو رکات نوێژ بکە دەتپارێزێ لە خراپەی چوونە ژوورەوە بۆ ناوماڵ.

---

(١)أخرجه الترمذي، وإبن خزيمة وحسنه لغيره الألباني في صحيح الترغيب والترهيب:(٦٢٤).

(٢) أخرجه أحمد و البزار و غيرهما و صححه الألباني: (١/٥٨).

(٣) أخرجه البزار و البيهقي في شعب الايمان و أنظر الصحيحة: (١٣٣٣).

ئەگەر نوێژەکانمان بەرهەڵستی تاوانی لێ نەکردین، دەبێ بکەڕێین بزانین دەردەکە چییە، نەخۆشییەکەمان چییە و دەرمانی بۆ بدۆزینەوە و چارەسەری بکەین، وەك چۆن چارەسەری نەخۆشییەکانی جەستەمان دەکەین، بێگومان چارەسەری نەفس لە پێشترە.

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (إِنَّ أَوَّلَ مايُحَاسَبُ بِهِ الْعَبْدُ يَوْمَ القِيامَةِ الصَّلاةُ، فَإِنْ صَلُحَت، صَلَحَ لَهُ سَائِرُ عَمَلِهِ، وَإِنْ فسَدَتْ فَسَد سائِرَ عَمَلِه)[1]. واتە: یەکەم شتێ بەندە لە قیامەتدا موحاسەبەی دەکەن لە سەری نوێژە، ئەگەر نوێژەکانی پەسەند و تەواو بوون، ئەوا کردەوەکانی تریشی چاك و تەواو دەبن و سەرفراز و سەرکەوتوو دەبێت، ئەگەر خراپ ئەنجامی دابوون وتەواو نەبوون ئەوا کردەوەکانی تریشی خراپ و ناتەواو دەبن، ئەو کاتە دۆڕاو و پەشیمانە و سەرەنجامی دۆزەخە.

نوێژ چاك و پەسەند نابێ تا بیروباوەڕ چاك نەبێ، خاوەنەکەی خوای گەورە بە چاودێر نەزانێ بەسەر خۆیەوە، بەترس و لەرزەوە ئەنجامیان نەدا، بیر نەکاتەوە لە موحاسەبەی بەردەم خوای پەروەردگار، کە رادەوەستێنرێ بەبێ تەرجومان، بەبێ پشت و پەنا، بەبێ ئەوەی دادوەرێ بەرگری لێ بکا، دەرچوون نیە لە سزای خودا مەگەر یەکێ خوا خۆی بیەوێ.

ئەگەر نوێژخوێن بەوشێوەیە نوێژەکەی کرد و تەواو بوو ئیتر دەرگای فیتنە و خراپەی بۆ دەکرێتەوە، بەڵام لە دڵیدا هێزێك دروست بووە بۆ بەرپەرچ دانەوەی ئەو گوناهو تاوان و خراپانە، ئیتر سەیری ئەو هەموو خۆشی و برق و باقی دونیایە ناکات کە فانی و لەناو دەچن، بیر لە خۆشییەکانی بەهەشت دەکاتەوە کە بەردەوام و نەبڕاوەن، نیعمەتانێکی بێ کۆتایین، خۆشبەختی و ئارامی هەتا هەتایین نابڕێنەوە، بەو شێوەیە خێرو چاکەی بەردەوام هەڵدەبژێرێ و واز لە شتە لە ناوچوو و فانییەکان دێنێ.

نوێژ تەواو نابێ بەبێ چاودێری خوایی بەسەریەوە، بەبێ تەقوا و لە خوا ترسان، ئەگەر نوێژ چاك و دروست ئەنجام نەردێ ئەوا دڵیش خراپ دەبێ و خشوعی نامێنێ، ئەندامەکانی تریش خراپ دەبن، بەڵام ئەگەر دڵ چاك بوو ئەندامەکانی جەستە هەموویان چاك دەبن، دەست چاك دەبێ ئیشی خراپە ناکات، دزی ناکات، شتی خراپ نانووسێت،

---

(١) أخرجه الترمذي في الصلاة: (٤١٣)، وأبو داود: (٨٦٤)، والألباني في صحيحه: (١٣٥٨)، .

زینای دەست لێدانی پێ ناکرێ، دەست ناوەشێنێ.. ئەگەر قاچەکان چاك بوون، هەنگاو هەڵناگرن بۆ شوێنی خراپ، بەرەو مزگەوت و رێگای چاکە هەنگاو هەڵدەگرن و دەڕۆن.. ئەگەر گوێ چاك و دامەزراو بێ گوێ ناگرێت بۆ گۆرانی و مۆسیقای بەرەڵایی و ناشەرعی، غەیبەت و قسەی خراپ نابیستێ.. ئەگەر زمان چاك بێت غەیبەتی پێ ناکرێ، بە چاکە نەبێ نادوێ..ئەگەر دڵ خراپ بوو فەرمان دەدات بە خراپە و هەموو ئەندامەکانی جەستەش بانگ دەکات بۆی..

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (ألاَ وَإنَّ في الجَسَدِ مُضْغَةً، إذَا صَلُحْتَ صَلُحَ الجَسَدُ كُلُّهُ، وَإذا فَسَدت فَسَدَ الجَسَدُ كُلُّهُ، ألا وَهيَ القَلب)[1]. واتە: لەناو جەستەدا پارچە گۆشتێکی بچوك هەیە ئەگەر چاك بوو ئەوا هەموو جەستە چاك دەبێ، خۆ ئەگەر خراپیش بوو ئەوا هەموو جەستە خراپ دەبێ، ئەو پارچە گۆشتە بچوکەش دڵە.

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (تُعرَضُ الفِتَن على القُلوبِ كَعَرضِ الحَسيرِعوداً عوداً، فَأي قَلبٍ أُشرِبُهَا نَكَتَت فيهِ نُكتَةُ السَوداء، وأَي قَلبٍ أنكَرَها نكت فيه نكتة بيضاء. حتّى تَصيرعلى قَلبَين، على ابيض مثل الصَّفا، فلا تضره فتنة ما دامت السماوات والارض، والاخر اسود مُرباداً، كالكوز مَجخياً لا يُعرَفُ مَعروفاً ولا يَنكر مُنكراً، الا ما أُشرِبَ مِن هَواهُ)[2]. واتە: بەڵاو فیتنە دەنوسێت بە لاتەنیشتی دڵەوە و پەڵە لەسەر پەڵە یان خاڵ لەسەرخاڵ وەك ریزکردن و لکاندنی شوڵەکانی حەسیر پێکەوە یەك لە تەنیشت یەك، جا هەر دڵێك وەریگرت یان خواردیەوە ئەوا خاڵێکی رەشی لەسەر دەنەخشێت، هەر دڵێکیش وەرینەگرێت و بیداتە دواوە ئەوا خاڵێکی سپی لەسەر دەنەخشێت و پێوەی دەنوسێت، تا سەرەنجام خاوەنەکەی دڵی سپی دەبێت، وەك بەردێکی سپی و ساف لێ دێت کە هیچی پێوە نەنوسێت فیتنە و بەڵا کاری لێ ناکات هەتا ئاسمانەکان و زەوی بەردەوام دەبن..یان وەك کوپەڵەیەکی رەشی هەڵە و گەڕاوە و خوار و خێچی لێ دێت چاکە بە چاك نازانێت و خراپەش ناداتە دواوە و بە ئارەزووی خۆی فیتنە و بەڵا دەچێتە ناوی.

---

(١) أخرجه البخاري: (٥٢) مسلم: (١٥٩٩) عن نعمان بن بشير.

(٢) أخرجه مسلم في كتاب الإيمان: (٣٦٧) ، جامع الصحيح: (١٢٨/١).

ئەگەر نوێژکردن گەیشتە ئەو رادەیە خاوەنەکەی گێڕایەوە لە تاوان و خراپە، ئەوکاتە دەبێتە خاوەنی ناوێك لە ناو ئەو کتێبەدا ناوی دەنوسرێ کە مۆر کراوە، تەنها ناوی خواناسە پایە بەرزەکانی تێدا تۆمار دەکرێت.

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمویت: (صَّلاة في أثرصَّلاة، لا لَغوٌ بَيْنَهُما، كِتابٌ في عِلّيّين)[1]. واتە: نوێژ لە دوای نوێژ بە رێك و پێکی و بە خشوعەوە، قسەی پڕو پووچیان لە نێوان دا نەکرێت، ئەوا کردەوەکانی دەچێتە ناو ئەو کتێبەی لە شوێنێکی بەرزدایە و تەنها ناوی پایە بەرزەکانی تێدا تۆمار دەکرێت.

## فەزڵی شەونوێژ

شەو نوێژ یەکێکە لە سوننەتە گەورەکان جگە لە نوێژە فەرزەکان خێری لە هەموو نوێژێکی تر زیاترە، دوو رکات دوو رکات دەکرێ و کۆتایشی بە سوننەتی وەتر دێ.

هەستان بۆ شەونوێژکردن خێرترین نوێژە لە دوای نوێژە فەرزەکان، خوای گەورە فەرمانی کردوە بە پێغەمبەر ﷺ کە بەشێك لە شەو بە نوێژ کردن بەسەر بەرێ، نەك هەمووی چونکە هەمووی سوننەت نیە تەنها هەندێك کات نەبێ، وەك دە شەوی کۆتایی مانگی رەمەزان، ئەگینا شەوەکانی تر هەستان و خەوتنەوە سوننەتە، نابێ زیادەڕەوی تێدا بکرێت بۆ ئەوەی کارنەکاتە سەر جەستەو بێ هێزی بکات.

خوای گەورە دەفەرمویت: ﴿ وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَتَهَجَّدۡ بِهِۦ نَافِلَةٗ لَّكَ عَسَىٰٓ أَن يَبۡعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامٗا مَّحۡمُودٗا ﴾ الإسراء: ٧٩. ئەی پێغەمبەر! لە بەشێکی شەوگاردا خۆت ماندوو بکە و قورئان بخوێنە، کە زیادە ئەرکێکە لەسەر تۆ، بۆ ئەوەی پەروەردگارت پایە و مەقامە بەرزەکەت پێ ببەخشێت، هەندێك لە زانایان دەڵێن مەبەست لە (مقاما محمودا) پایەی شەفاعەتی گەورەیە لە قیامەتدا، هەروەها با سوپاس کراو بیت لە لایەن هەموو بەدیهێنراوانەوە.

(١) أخرجه أبو داود، وحسنه الألباني في صحيح الترغيب و الترهيب: (٤٤٦).

خوای گەورە وەسفی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ و ئیمانداره ڕاستەقینەکان دەکات بەوەی کەمێك لەشەو دەخەون، شەویان بەعیبادەتی پەروەردگار و خوا پەرستی بەڕێ دەکەن، قورئان دەخوێنن و زیکر و یادی خوادەکەن: ﴿ كَانُوا۟ قَلِيلًا مِّنَ ٱلَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ ﴾ الذاريات: ١٧.

موسڵمان ئەگەر بەجوانی و تێ گەیشتنەوە سورەتی (المزمل) بخوێنێتەوە پەندو ئامۆژگاری زۆری لێ وەردەگرێ، خوای گەورە لەوکاتە ناخۆشەدا فەرمانی کردووە بە پێغەمبەر ﷺ شەونوێژ بکات، کە سەرەتای وەحییە، دوای ئەوەی جوبرەئیل وەحی بۆ هێنا و وتی بخوێنە تا سێ جار، بخوێنە بەناوی خواوە ترس و لەرزی لێ نیشت و هاتەوە بۆ ماڵەوە بە خەدیجەی فەرموو: دامپۆشە دامپۆشە، خۆی پێچایەوە و خۆی داپۆشی تا لەو کاتەدا خوای گەورە فەرمانی پێکرد شەونوێژ بکات: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُزَّمِّلُ ۝١ قُمِ ٱلَّيْلَ إِلَّا قَلِيلًا ﴾ المزمل: ١- ٢. واتە: ئەی ئەو کەسەی خۆت داپۆشیوە ئەی موحەممەد! هەستە شەونوێژ بکە مەگەر بەشێکی کەم لە شەو نەبێت.. بۆ ئەوەی پەروەردەی بکات، دڵی پابەندبێ پێوەی و دامەزراوبێ لە سەری.

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (..أَفْضَلُ الصَلاةِ بَعْدَ الفَرِيضَةِ صَلاةُ اللَّيلِ)[١]. واتە نوێژ لەدوای نوێژە فەرزەکان شەونوێژە.

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (في الجَنَّةِ غُرفَةٌ يُرى ظاهِرُها مِنْ بَاطِنِها، وبا طِنُها من ظَاهِرِها، فَقَالَ أَبو مَالِكٍ الأشعَرِي: لِمَنْ هِيَ يَارَسُولُ الله ؟ قالَ: لِمَنْ أطابَ الكَلام، وأَطعِم الطَعام، وَبَاتَ قائِماً والنَّاسُ نِيامٌ)[٢]. واتە: بەهەشت ژووری وای تێدایە لە ناویەوە دەرەوەی دەبینی، لە دەرەوە ناوەوەی دەبینی، ئەبو مالیکی ئەشعەری (ڕەزای خوای لێ بێ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە بۆ کێیە؟ فەرمووی: بۆ ئەو کەسەیە کە قسەی جوان و چاك بکات، خواردن بدات بە فەقیر و هەژاران، شەونوێژ بکات لە کاتێکدا خەڵك خەوتوون، قورئانی زۆر بخوێنێ لە شەودا.

---

(١) رواه مسلم: (١١٦٣).

(٢)أخرجه الطبراني والحاكم وقال الألباني حسن صحيح في صحيح ترغيب والترهيب:(٦١٧)

* پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (يَعْقِدُ الشيطانُ عَلى قافِيَةِ رأسِ أحَدِكُم اذا هُوَ نامَ ثَلاثَ عُقَد، يَضرِبُ على كُلِ عُقدَة، عَلَيْكَ لَيْلٌ طوَيْلٌ فارقَد، فَإن اسْتَيْقظَ، فَذَكَرَ الَّلهِ تَعالى، انحَلَّت عُقْدَةٌ، فَإِن توضَّأ، انحَلَّت عُقْدَةٌ، فَإن صَلَّى، انحَلَّت عُقدَة كُلُّها، فَأصبحَ نَشِيطاً طَيِّبَ النَّفسِ، وَإِلا أصْبَحَ خَبيثَ النَّفسِ كَسْلانَ)[1]. واتە: کاتێك دەخەون شەیتان سێ گرێ دەدات لە بەشی دواوەی سەری هەریەکێك لە ئێوە و، دەڵێ: بخەوە شەوگارێکی دوور و درێژە راکشێ لێی بەبێ خەم، ئەگەر هەستا لە خەو و زیکر و یادی خوای کرد، ئەوا گرێیەکیان دەکرێتەوە، ئەگەر دەستنوێژی گرت، ئەوا گرێیەکی تریشیان دەکرێتەوە، ئەگەر نوێژی کرد ئەوە گرێکەی تریش دەکرێتەوە، دڵخۆش و چوست و چالاك دەبێ، ئەگەر واشی نەکرد ئەوا تەمەڵ و سست و پەست و دڵگران دەبێ.

* موغیرەی کوڕی شوعبە فەرمووی: قام النبيُّ ﷺ حتّى تورّمت قَدَماهُ، فَقيلَ لَهُ: قَدْ غَفَرَ اللهُ لَكَ مَاتَقدّم مِن ذَنْبِكَ وماتأخّر، فقال: (أفَلا اكون عبداً شكوراً)[2].

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەندە بە پێوە مابوەوە لە شەونوێژدا قاچەکانی ئاوسا بوون، لێیان پرسی: خوای گەورە لە تاوانی رابردووت و داهاتویشت خۆش بووە بۆ ناوادەکەی لە خۆت، فەرمووی: ئەی نابێ بەندەیەکی سوپاس گوزارم.

* عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: (أَحَبُ الصَّلاة إلى اللهِ صَلاةَ داوُد، كانَ يَنامُ نِصفَ الَّيلِ، وَيَقُمُ ثُلثَهُ، وَيَنامُ سُدُسَهُ، وَيَصُومُ يَومَاً، وَيُفطِرُ يَوماً)[3]. واتە: خۆشەویستترین نوێژ لای خوا نوێژی داودە سەڵاوی خوای لەسەر بێت، وە خۆشەویستترین رۆژوو لای خوا رۆژووی داودە، نیوەی کاتی شەو دەخەوت، سێیەکی شەویشی بۆ شەونوێژ تەرخان کردبوو، شەش یەکی شەو دەخەوتەوە، رۆژی نا رۆژێکیش بە رۆژوو دەبوو.

* جابر (ڕەزای خوای لێ بێ) گێڕایەوە و فەرمووی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: (إِنَّ في الَّيل لَسَاعةً، لايوافِقُها رَجُلٌ مسلِم يَسْألُ اللهُ خَيْراً من أمْرِ الدُنيا

---

(١) متفق عليه، أخرجه البخاري: (٣٢٦٣)، و مسلم في صلاة المسافرين: (٢٠٧).

(٢) أخرجه البخاري: (١١٣٠) ومسلم: (٢٨١٩).

(٣) أخرجه البخاري: (٣٤٢٠) ومسلم في صلاة: (١٨٩).

وَالآخِرَةَ، إلاّ اعْطاهُ اللّهُ إيّاهُ، وذلِك كُلّ لَيْلَة)[1]. هەموو شەوێك كاتێكی تایبەتی تێدایە، هەر پیاوێكی موسوڵمان بۆی ڕێك بكەوێ لەو كاتەدا هەر شتێك داوا بكات لە خێر و بێری دنیا و قیامەت بێگومان خوای گەورە پێی دەبەخشێت، ئەوكاتەش دیاری كراو نیە لە هەموو شەوێكدا ئەوكاتە هەیە.

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (ينزل ربنا تبارك وتعالى كل ليلة إلى سماء الدنيا حين يبقى ثلث الليل الآخر فيقول من يدعوني فأستجيب له من يسألني فأعطيه من يستغفرني فأغفر له)[2]. واتە: خوای گەورە هەموو شەوێك دادەبەزێتە ئاسمانی دونیا، كاتێك بەشی كۆتایی لە سێ بەشی شەو دەمێنێ دەفەرموێت: كێ لێم دەپاڕێتەوە تا لێی وەربگرم؟، كێ داوایەكی هەیە تا پێی ببەخشم؟ كێ داوای لێ خۆشبوون دەكات تا لێی خۆشبم؟!.

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (رَحِمَ اللّهُ رَجُلاً قَامَ مِنْ الَّيلِ فَصَلّى وأَيْقَظَ امْرَأَتَهُ فَإِنْ أَبَت نَضَحَ فِي وَجْهِها الْمَاءَ، رَحِمَ اللّهُ امْرَأَةً قَامَتْ مِنْ الَّيلِ فَصَلَّت وَأَيْقَظَت زَوْجَهَا فَإِف أبى نَضَحت فِي وَجْهِهِ الْمَاءَ)[3]. واتە: ڕەحمەتی خوا لەو پیاوەی كە شەو هەستا بۆ شەو نوێژ ژنەكەشی هەڵدەسێنێ ئەگەر خەو بەری نەدا یان تەمەڵی كرد و هەڵنەسا ئاو دەپژێنێ لەدەم و چاوی، هەروەها ڕەحمەتی خوا لەو ژنەی كە هەستا بۆ شەو نوێژ و مێردەكەشی هەڵدەسێنێ، ئەگەر خەبەری نەبووەوە لەبەر تەمەڵی ئاو دەپژێنێ لە دەم و چاوی تا خەبەری دەبێتەوە.

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (عَلَيْكُم بِقيام اللّيلْ، فإِنَّهُ دَأْبُ الصَالِحينَ قَبْلَكُم، وَقُرْبَةٌ الى ربِّكُم وَمُنْهاةٌ عَنِ الإثمِ وَمَكْفَرَةٌ للسّيِّئات)[4]. واتە: شەو نوێژ بكەن و بەردەوام بن لەسەری بەگوێرەی توانا، چونكە ئاكار و ڕەوشتی پیاوچاكانی پێش ئێوە بووە،

---

(١) أخرجه مسلم: (٧٥٧).

(٢) صحيح سنن أبي داود: (٣٤/٢) (١٣١٥).

(٣)ابن ماجه:(١٣٣٦) وأبوداود: (١٣٠٨)،والألباني في صحيح الترغيب والترهيب):(٦٢٥)

(٤) أخرجه الترمذي، وحسنه لغيره الألباني في صحيح الترغيب و الترهيب: (٦٢٤).

نزیك بوونەوەیە لە پەروەردگارتان، بەرهەڵستیکەری خراپە و تاوانە و هۆی کەفارەت و لێ خۆشبوونی کردەوە ناپەسەندەکانتانە.

* پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (إذا أَيقَظَ الرَّجُلُ أَهْلَهُ مِنَ اللَّيلِ فَصَلَّيَا أوصَلَّى رَكْعَتَينِ جَميعاً، كُتِبا في الذَّاكرينَ وَالذَّاكِرَاتِ)[1]. واتە: ئەگەر پیاوێك شەو هەستا لەخەو و ژن و منداڵەکانیشی هەستان دوو رکات نوێژیان کرد بە جەماعەت یان بە تەنها یەکی دوو رکاتیان کرد ئەوا ناویان لە ناو ریزی ئەوانەدا دەنوسرێت کە هەمیشە و بەردەوام زیکر و یادی خوا دەکەن.

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (مَنْ قام بِعَشْرِ آيات، مِنَ لَمْ يُكتَبْ مِنَ الغَافِلِينَ، وَمَن قامَ بِمَائَةِ آيَةٍ كُتِبَ مِنَ القانِتين، وَمَن قَامَ بِأَلْفِ آيَةٍ كُتِبَ مِنَ المُقَنطَرين)[2]. واتە: هەرکەسێك لەشەودا دە ئایەت بخوێنێ ئەوە ناوی تۆمار ناکرێ لە ریزی بێ ئاگاو لە خوا غافڵەکان، ئەگەر کەسێ سەد ئایەت بخوێنێ ئەوا ناوی لە ریزی ئەو کەسانە دەنوسرێت کە لە فەرمان بەرداری خوای گەورە دەرناچن و لە شەو نوێژدا زۆر بەپێوە رادەوەستن، ئەگەر کەسێ هەزار ئایەت بخوێنێ ئەوا ناوی لە ریزی ئەوانەدا تۆمار دەکرێ کە بەقەد دنیاو ئەوەشی لە ناویدایە خێریان بۆ نوسراوە.

* پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (لاَ حَسَدَ إلا في إثنَتَينِ رَجُلٌ آتَاهُ اللهُ القُرانَ، فَهُوَ يَقُمُ بِهِ آناءَ اللَّيلِ و آناء النَّهار، وَرَجُلٌ آتاهُ اللهُ مَالاً فَهُوَ يُنْفِقُهُ آناء اللَّيلِ و آناء النَّهارِ)[3]. واتە: ئاوات خواستن تەنها بە دووکەس دەبرێت، پیاوێك قورئان خوێن بێ شەو و رۆژ بیخوێنێ و کاری پێ بکا، پیاوێکیش خوای گەورە ماڵ و سامانی پێ بەخشیبێ ئەویش شەو و رۆژ لێی ببەخشێ لە پێناوی خوا. دەبێ ئاوات نەخوازرێ بۆ لەناو چونی نیعمەتی ئەوکەسانە، تەنها ئەوەندە نەبێ کە ئاوات بخوازرێ کە وەك ئەوان بن.

---

(١) أخرجه أبوداود في الصلاة: (١٣٠٩)، والطبراني في الصغير: (٨١/١).

(٢) أبوداود و ابن خزيمة وصححه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب: (٦٣٩).

(٣) أخرجه البخاري: (٧٥٢٩) و مسلم: (٨١٥).

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو شەوێك وەتری دەکرد ئیتر لە ئەوەڵی شەودا بوایە یان لە ناوەڕاستەوە یان لە کۆتایی شەودا بوایە[1].

سوننەتە لە ڕکاتی کۆتای سوننەتی وەتردا دوعای قنوت بخوێنرێت بەم شێوەیە و پاشان سڵاوات بدرێ لە دیداری خۆشەویستمان: (اللهم اهدني فيمن هديت، وعافني فيمن عافيت، وتولني فيمن توليت، وبارك لي فيما أعطيت وقني شرّ ما قضيت، إنك تقضي ولا يقضى عليك، وإنه لا يذلّ من واليت، تباركت ربنا وتعاليت)[2].

أبو دەرداء (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمویەتی: دوو ڕکات نوێژ لە تاریکی شەودا بکەن بۆ ئەوەی لە تاریکی گۆڕدا فریاتان بکەوێت[3].

تەمیمی داری (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) شەوێ خەبەری نەبوودەوە بۆ شەونوێژ یەك ساڵی تەواو بە شەو نەدەخەوت تا بەیانی بە عیبادەتەوە خەریك دەبوو[4]!!.

## نوێژ مایەی بەختەوەرییە :

نوێژ کردن کلیلی هەموو خێرو خۆشییەکە، بە نوێژ کردن دڵ ئارام و بەختەوەر دەبێ و دەحەوێتەوە، ڕۆح دڵنیا دەبێ، نوێژ قوتی ڕۆحە و بەهێزی دەکات بەرامبەر بەڵاو ناخۆشییەکان، بە نوێژکردن چاوگەش و ڕووناك دەبێ.

نوێژ کردن بەندە فێری ئادابی خواپەرستی دەکات، ڕێز و گەورەیی خوا دەخاتە دڵەوە، نوێژخوێن دەڕازێنێتەوە بە ڕەوشت و ئاکاری جوان وەك: نەرم و نیانی، ڕاستگۆیی، هێمن و ئارامی، دادپەروەری، قانعی، بەوەفایی. هەروەها نوێژخوێن لەکردار و گوفتارە خراپەکانیش دووردەخاتەوە وەك: درۆکردن، فرو فێڵ وخیانەت، تەماعبازی، بێوەفایی، تووڕەیی، خۆبەزل زانی، زوڵم و ستەم، ئیرەیی و، چەندەها ڕەوشتی خراپ و کاری ناپەسەندی تر..

---

(١) البخاري: (١٩٩٦)، ومسلم: (٧٤٥).

(٢) أبو داود: (١٤٢٥).

(٣) جامع العلوم والحكم لإبن رجب (رحمه الله).

(٤) مختصر منهاج القاصدين للمقدسي (رحمه الله).

ئەی ئەو کەسەی ئارامی و خۆش بەختیت دەوێ، رووناکی چاوەکانت دەوێ رووبکە نوێژ کردن بەخشوع و زەلیلیەوە وەك پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی، ئەو کاتە حەز و ئاواتەکانت دێتەدی و بەختەوەر دەبی، خۆ ئەگەر واشت نەکرد ئەوە تەنها لۆمەی خۆت بکە و، گوناهی خۆت لە ئەستۆی خۆتدایە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَطۡمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكۡرِ ٱللَّهِۗ أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ ﴾ الرعد: ٢٨. ئەوانەی ئیمانیان هێناوە دڵ و دەروونیان ئارام دەبێت بە خوێندنی قورئان و پەیامەکەی خوای پەروەردگار، ئاگادارین دڵەکان هەر بە زیکر و یادی خوا و قورئان خوێندن ئارام دەبن و دەحەوێنەوە.

شاعیر دەڵێت:

یا من ترجوا النّجاة لَم تَسلُك مسلكها فإنَ السفينة لا تجري على يبس.

واتە: ئەی ئەو کەسەی بە هیوای رزگاریی و بەختەوەریت رێگای رزگاریی و بەختەوەریشت نەگرتووە، کەشتی لە ناو وشکاییدا ناڕوات هەرچەندە سەوڵ لێ بدەی.. واتە جگە لە ماندوو بوون هیچی تری پێ نابرێت!. بە نوێژکردن ئیماندار هەست بەحەوانەوە و ئارامی و دەکات، کاتێك دەڵێ: (الله اكبر) نوێژ دادەبەستێ واتە خوا جل جلاله لە هەموو شتێك بەگەورە تر دەزانێ ئیتر ترسی لە هیچ کەسێك نییە.. کە دەڵێ: ﴿ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ۝٢ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ الفاتحة: ٢ - ٣ هەست بەنیعمەتەکانی خوادەکات لە بەزەیی و رەحمەتی بەرامبەر بە ئیماندار..کاتێك دەڵێت: ﴿ مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴾ الفاتحة: ٤ هەست بە گەورەیی خوا دەکات..کەدەڵێت: ﴿ إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ﴾ الفاتحة: ٥ هەست بە پەیوەندی نێوان خۆی و پەروەردگاری دەکات پشتی پێ دەبەستێ و داوای کۆمەك و یارمەتی بە تەنها لەو دەکات و بەس..کاتێك دەڵێت: ﴿ ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ۝٦ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴾ الفاتحة: ٦-٧، هەست دەکات چەندە پێویستی بە هیدایەتە و هیدایەتیش تەنها بەدەست خوایە.. ئابەو شێوەیە نوێژخوێن هەست بە زیندوێتی و گەشانەوە دەکات، ئاو پڕێنێ دڵ و دەروونی دەکات بە نوێژەکەی، بێگومان

تەنها بە زیکر و یادی خوا دڵ ئارام دەبێ، دەی گەورەترین زیکر و یادی خوداش نوێژە.

ئەگەر مرۆڤ بەو جۆرە بوو بەندەی خوا بوو بەڕاستی و بەندایەتی بۆ خوا کرد، هاوەڵی بۆ بڕیار نەدا و، کردەوەی چاکەی کرد، ئەو کاتە سەربەرزانە دەژی و لەکەس ناترسێت، غەم و پەژارە و خەفەتی نیە و ژیانی پڕ لە خۆشی و کامەرانی دەبێت، لە کاتێکدا خەڵك زەلیل و ژێر دەستەی ئەم و ئەون و سەریان دانەواندووە بۆیان، بەڵام موسڵمان سەر بۆ هیچ کەسێك دانانەوێنێ جگە لە خودا، کە ئەوەش خۆی بۆ خۆی بەهەشتێکە تێیدا دەژی: ﴿ مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً ۖ وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾ النحل: ٩٧.

* پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (هەریەکێ لە ئێوە کاتێك خەوت شەیتان سێ گرێ دەدات لە بەشی دواوەی سەری و دەستیان پیا دەهێنێ و دەڵێ: بخەوە شەوگارێکی دوور و درێژە بێ خەم لێی راکشێ، ئەگەر هەستا لەخەو و یادی خوای کرد گرێیەکیان دەکرێتەوە، ئەگەر دەست نوێژی گرت ئەوا گرێیەکی تریان دەکرێتەوە، ئەگەر نوێژیشی کرد ئەوا گرێکەی تریشیان دەکرێتەوە، ئەوکاتە گورج و گۆڵ و دڵخۆش دەبێ و چالاك دەبێ، ئەگەر وای نەکرد بە پێچەوانەوە پەست و سست و تەمەڵ دەبێ. لە ریوایەتێکی تردا هاتووە: (فَيُصبح نَشيطاً النَّفْس قَدْ أصابَ خَيراً، وَإِنْ لَم يَفْعَل، أَصْبَحَ كَسْلان، خَبيث النّفس، لَم يُصِب خيراً)[1]. ئەو کاتە نەفسی پاك و چالاك دەبێ، تووشی خێر و خۆشی دەبێت، ئەگەر واشی نەکرد ئەوە تەمەڵ و تەوەزەل دەبێ و، نەفسی پیس و پەست دەبێت، توشی خێر نابێ.

* پێغەمبەری خوا ﷺ هەرکاتێك توشی بەڵاو ناخۆشی ببوایە هانای بۆ نوێژ دەبرد و بانگی بیلالی دەکرد دەیفەرموو: (أقم الصلاة يا بيلال، أَرِحنا بها)[2]. واتە: ئەی بیلال! هەستە بانگ بدە و قامەت بکە با بەکردنی نوێژەکان دڵخۆش و ئارام بین.

---

(١) أخرجه ابن ماجه (صحيح سنن إبن ماجه) (١٠٩٤).

(٢) صحيح سنن أبو داود: (٤١٧١)، وصححه الألباني في المشكاة: (٢٥٣).

* هەروەها دەیفەرموو: بەرچاو روونی و خۆشبەختی من لە نوێژدایە و، نوێژ بیبیلەی چاوی منە: (جَعَلْتُ قُرَّةُ عَينِي فِي الصَّلاَة)[1].

هەندێك لە زانایان دەڵێن: ئەگەر پاشا و نەوەی پاشاکان بیانزانیایە ئێمەی موسڵمان چەندە دڵمان خۆشە بە زۆری شمشێر لێان دەسەندین ئەگەر دەسەڵاتیان بوایە[2]!.

ئیبن تەیمیە (رەحمەتی خوای لێ بێ) دوژمنانی ئازاریان دەدا و زیندانییان کرد فەرمووی: چیتان دەوێ لێم؟ من بەهەشتی خۆم لە ناو سنگمدایە ئێوە ناتوانن دەری بهێنن، زیندانی کردنم خەڵوەتە، دەربەدەر کردنم سەیران و سیاحەتە، کوشتنیشم پلەی بەرزی شەهادەتە!. هەروەها کاتێك خستیانە زیندانیانەوە پێی بێ تاقەت نەبوو لێیان پرسی؟ ئەویش وتی: زیندانی کەسێکە دڵی زیندان بێت لە یادی خوا، ئەسیریش کەسێکە ئەسیری هەوا و هەوەسی بێت[3].

کاك ئەحمەدی موفتی زادە (رەحمەتی خوای لێ بێ) لە هۆنراوەیەکدا دەڵێت:

لە دەوری جەمی یارانی جانی تۆم نەبێ هێشتا خۆم پێ تەنهایە
تۆم هەبێت تەنها لە ئینفرادی لێم جەمە هەرچی خۆشی دنیایە.

ئەبوبەکری وەراق (رەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرموێت: ئەگەر هەوا و هەوەس زاڵ بێت بەسەر دڵ و دەروونی مرۆڤدا: دڵی تاریك دەبێت، ئەگەر دڵیش تاریك بوو تەنگ دەبێت وەك پاڵە پەستۆ بخەیتە سەرسنگ ئاوەهایە، ئەگەر دڵیش تەنگ بوو، خوورەوشت ناپەسەند و ناشیرین دەبێت،ەگەر خوورەوشت ناشیرین بوو خەڵك رقیان لێی دەبێت[4].

عەبدوڵای کوری موبارەك (رەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرموێت:

رَأَيْتُ الذُّنُوبَ تُمِيتُ القُلُوبَ وَقَدْ يُورِثُ الذُّلَّ إِدْمَانُهَا

(١) أخرجه أحمد وحسنه الألباني في المشكاة: (٥٢٦١)، وأنظرالصحيحة: (١٨٠٩).
(٢) عوائق، محمد احمد راشد.
(٣) ذيل طبقات الحنابله (٢/٤٠٢).
(٤) العوائق، محمد احمد راشد.

وَتَرْكُ الذنُوبِ حَيَاةُ القُلُوبِ          وخَيْرٌ لِنَفْسِكَ عِصْيَانُها

تاوان دڵ دەمرێنێت ئەو کەسەی بەردەوام بێت لە سەری سوك و رسوایی بەشیەتی، ئەو کەسەش خۆی بە دوور بگرێت لە تاوان بێگومان دڵی دەژێتەوە و نەفسی ئارام دەبێت.

ئیماندار کاتێك هەر لە بەیانی تا نیوەڕۆ کار دەکات باری قورس و گران دەبێ بێ هێز دەبێت، شتی خراپ دەبیستێ، خوای گەورەش فەرمانی پێ دەکات کە بچێ بۆ نوێژ بۆ ئەوەی بحەوێتەوە و ئارام بێ، یان لەماڵەوە و دەنگە دەنگی مناڵ و بۆڵە بۆڵی ژن، سەرقاڵبوون بە میوانەوە بێ تاقەتی دەکات، پاش ماوەیەك بەو شێوەیە کاتی نوێژ دێت ئەگەر چوو بۆ نوێژی جەماعەت یان هەر نوێژی کرد ئەوا ئارامیی دەداتە گیانی خۆی و دەحەوێتەوە، یان شەو لە جێگادا زۆر دەمێنێتەوە زۆر مانەوەش لە جێگادا لەرادەی خۆی تێپەڕێ نەخۆشی و تەمەڵییە بەڵام کە هەستا لە خەو ماسولکەکانی دەکەونە جوولە، ئەوکاتە چوست و چالاك دەبێ.

# خشوع لە نوێژدا

ئیبن رەجەبی حەنبەلی (رەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێ: خشوع بریتییە لە زەلیلی نواندن لە بەردەم پەروەردگاری باڵا دەست و خاوەن دەسەلاتی رەهادا.

ئامادەیی دڵ لە نوێژدا رۆحەکەیەتی، وەك سەر وایە بۆ جەستە، وەك ئاو وایە بۆ ماسی، دڵ ئامادە نابێ و پاك نابێتەوە تەنها بە وازهێنان لە گوناە و تاوان نەبێ، بە قورئان خوێندن و زیکر و یادی خوا و نوێژ کردن دەگاتە ئەو رادەیەی کە خاشع بێ، ترسی خوای تێدا بێ، خۆی چاك بێ و فەرمانیش بدات بە ئەندامەکانی تر چاك بن، بۆ ئەوەی خشوع لە دڵدا زیاد بێ دەبێ زۆر سەجدە ببرێت و رکوع بە تەواوی ئەنجام بدرێت، دوعا و پاڕنەوەی زۆر بکرێت لە سەجدەدا.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ ﴿١﴾ الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ ﴾ المؤمنون: ١ - ٢. واتە: بەڕاستی ئەو ئیماندارانە سەرکەوتوو و سەرفراز بوون.. ئەوانەش ئەو

کەسانەن لە نوێژەکانیان دا ملکەچ و دڵ نارام و دڵ دامەزراوون دڵیان لای خوای خۆیانە و بەخشوعەوە نوێژەکانیان دەکەن.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ وَقُومُواْ لِلَّهِ قَٰنِتِينَ﴾ البقرة: ٢٣٨. إبن كثير (بەرەحمەت بێ) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێ: بەخشوع و گەردنکەچییەوە نوێژەکانتان ئەنجام بدەن، بە ملکەچی و زەلیلیەوە بەندایەتی خودا بکەن و پەرستشەکانی بەجێ بهێنن.

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (أول شيء يرفع من هذه الأمة الخشوع، حتى لا ترى فيها خاشعا)[1]. واتە: یەکەم شتێك لە ناو ئەم ئومەتەدا نامێنێت خشوعە، تا وای لێ دێت یەکێك نابینی بە خشوعەوە نوێژ بکات.

* پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (مَا مِنْ امْرِىءٍ مُسْلِمٍ تَحْضُرُهُ صَلَاةٌ مَكْتُوبَةٌ فَيُحْسِنُ وُضُوءَهَا وَخُشوعَهَا وَرُكُعَهَا إلاّ كانَت كفَارةً لِمَا قَبْلَهَا مِنْ الذُّنوبِ مَالَمْ يُؤتِ كَبْيرةً وَ ذلِكَ الدَّهر كُلُّهُ)[2]. واتە: هەر موسڵمانێ کاتی یەکێك لە نوێژە فەرزەکان هاتە پێشەوە، بە جوانی و رێك و پێکی دەستنوێژی بۆ بگرێ و بە خشوعەوە نوێژەکەی بکات و بە تەواوی رکوع ببات، ئەوا دەبێتە کەفارەتی گوناهەکانی رابردووی، بە مەرجێ لە گوناهە گەورەکان نەبن ئەمەش هەتا هەتاییەو بەردەوامە.

ئەگەر خشوع نەما لە دڵدا وێران دەبێ، ئەوکاتە نەخۆشی ترسناك ڕووی تێ دەکەن و سەردەکەون بە سەریدا و ڕەشی دەکەنەوە، وەك خۆشەویستی دنیا و پێشبڕکێ بۆ کردنی، بێ ئاگایی و غەفڵەت، شوێنکەوتنی هەوا و هەوەس و ئارەزووبازی، بە خۆدا نازین و خۆ بەگەورە زانین و لوت بەرزی، تا وای لێ دێ پەند و ئامۆژگاری وەرناگرێ و کاریگەریان نابێ لە سەری.

فالقلب ما لم يكن بالله مرتبطاً فإنّما هو بالأهواء جواب.

(١) رواه الهيثمي: (٢ /١٣٦)، وقال الألباني صحيح في صحيح الترغيب والترهيب: (٥٤٣).

(٢) أخرجه مسلم: (٢٢٨)، صحيح الترغيب و الترهيب: (٣٦٠).

واتە: ئەگەر دڵ بە خواوە پەیوەست نەبوو، ئەوا وەڵام دەرەوەی هەوا و هەوەس دەبێت واتە شوێنی حەز و ئارەزووە ناشەرعیەکان دەکەوێت.

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (لەجەستەدا پارچە گۆشتێکی بچوك هەیە ئەگەر باش بوو ئەوا هەموو ئەندامەکانی تر باش دەبن، ئەگەر خراپیش بوو ئەوا هەموو ئەندامەکانی تریش خراپ دەبن، کە ئەویش دڵە.[1].

پێغەمبەری خوا ڕێك ڕادەوەستا لە نوێژدا ملی لار نەدەکردەوە و سەری کز نەدەکرد بە چالاکی و زەوق و شەوقەوە نوێژەکانی ئەنجام دەدا، هەروەها پەنای گرتووە بە خوا لە دڵێ کە خالی بێ لە خشوع: (أَللّهُمَ إِنّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ قَلْبٍ لاَتَخشَعْ..) [2].

عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لێ بێ) پیاوێکی بینی ملی لارکردبووەوە و سەری کز کردبوو لە نوێژدا پێی فەرموو: ئاینەکەمان مەکوژە خوا بتکوژێ.

هەروەها یەکێکی تری بینی ملی خوار کردبووەوە وەك ئەوەی کە خشوع بنوێنێ، عومەر فەرمووی: سەرت ڕاستکەرەوە خشوع لە دڵدایە لە ملدا نیە!.

ئەبو تەڵحە (ڕەزای خوای لێ بێ) جارێکیان لە ناو باخەکەی خۆیدا نوێژی دەکرد باڵندەیەکی جوان هات بە بەردەمیدا ئەویش دەستی کرد بە سەیرکردنی تا وای لێهات نەیدەزانی چەند ڕکات نوێژی کردووە، باخەکەی کرد بە خێر لە بریتی ئەو خشوع لەدەست دانەی[3]!.

حوزەیفە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئاگاداربن لە خشوعی دووڕووانە، وتیان: خشوعی دووڕووانە چۆنە، فەرمووی: ئەوەیە دەبینی جەستە وا پیشان دەدرێت کە خاشعە بەڵام دڵ غافڵ و بێ ئاگایە[4]!.

عوروەی کوڕی زوبێر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) کە یەکێ بووە لە فوقەهای تابیعین: برینێك لە قاچیدا بوو ڕۆژ بە ڕۆژ زیادی دەکرد، پزیشکەکان بڕیاریاندا قاچی ببڕنەوە ئەگینا

---

(١) أخرجه البخاري: (٥٢٥٥)، ومسلم: (١٥٩٩).

(٢) أخرجه مسلم: (٢٧٢٢).

(٣) مختصرمنهاج القاصدين لإبن قدامه.

(٤) المدارج السالكين لإبن قيم الجوزية: ١/٥٢١

هەموو جەستەی دەگریتەوە، لەو سەردەمەدا بەنج نەبووە تا بەنجی بکەن، فەرمووی: مۆڵەتم بدەن با بچمە ناو نوێژەوە، کاتێك چووە ناو نوێژەوە قاچەکەیان بۆ بڕییەوە هەستی بەئازار نەکرد چونکە دڵی سەرقاڵ بوو بە خوای خۆیەوە ئاگای لە دنیا نەما بوو[1].

ئیبن قەیم (بەرەحمەت بێ) دەڵێت: نوێژ بەبێ خشوع وەك جەستەی بێ گیان وایە، دەی لەوە شوورەیی تر دەبێ چی بێت پیاو جەستەیەکی بێ گیان بە دیاری بەرێت بۆ خاوەن دەسەلاتێکی دنیایی، چ جای بۆ خوای گەورە؟!.

سوفیانی سەوری (بەرەحمەت بێ) فەرمووی: ئەوەی خشوعی نەبێ نوێژەکەی خراپ دەبێ.

## کۆسپەکانی بەردەم خشوع :

هەندێك کۆسپ دەبنە هۆی کەمی خشوع یان نەمانی لە نوێژدا، جا هەیانە لەناو نوێژەکەدایە و هەشیانە لە دەرەوەی نوێژەکەدایە، ئەمانەی لای خوارەوەش چەند کۆسپێکن لە بەردەم خشوع دا:

١- لاوازی ئیمان بە گەیشتن بە دیداری پەروەردگار: یەکێ لە سیفاتی ئەوکەسانەی بە خشوعەوە نوێژ دەکەن ئەوەیە کە گومانیان نیە دەگەن بەدیداری خوای خۆیان، کەواتە ئەگەر نوێژخوێن گومانی هەبوو یان باوەڕی نەبوو بە زیندوو بوونەوە و موحاسەبە لەبەردەم پەروەردگاردا، ئەوکاتە بەخشوعەوە نوێژەکانی ناکات و بێ ئاگا دەبێ لە ڕۆحی نوێژەکەی.

٢- وەسوەسەی شەیتان: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (إِذا نُودِيَ بالصَّلاة، أَدْبَرَ الشَّيطان و لَهُ ضُراطٌ، حتّى إذا ثُوِّبَ بالصَلاَة أَدْبَرَ، حتى إذا قُضِيَ النِّداء أَقبل، حتى يَخْطر بَيْنَ المَرء وَنَفْسِه وَيَقُول: اُذكرُ كذا، وأذكر كذا، لما لم يَكُن يذكر، حتّى يَظلَّ الرُجل لايدرى كم صلّى) وفى روايه عند المسلم: (حَتّى يَظلَّ الرَجُل ان يدرى كيف صلّى)[2]. واتە: ئەگەر بانگدرا شەیتان هەڵدێ بە تڕ لێدان، بۆ ئەوەی بانگەکە نەبیستێ، کە بانگەکە تەواو بوو دێتەوە تا قامەت دەکرێ دیسان هەڵ دێتەوە، کە قامەت تەواو بوو دێتەوە

(١) وفيات الاعيان: ٣/٢٥٥، حلية الاولياء: ٢/١٧٨.

(٢) اخرجه البخاري: (٦٠٨). ومسلم: (٣٨٩).

وەسوەسە دەخاتە دڵی نوێژخوێنەوە و داڵغەی بۆ دروست دەکات و پێی دەڵێ: یادی ئەوە و ئەوە بکە کە پێشتر لە یادی نەبوو تا وای لێ دەکات نازانێ چەند رکات نوێژی کردووە. لە ریوایەتی (مسلم)دا هاتووە: (وا لە نوێژخوێن دەکات کە نەزانێ چۆن نوێژەکەی دەکات).

٣- ئاوڕدانەوە بەم لاو بەولادا لە نوێژدا: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (مَابَالُ أقْوامٍ يَرْفَعُونَ أبْصَارَهُم إلى السّماء في صَلاتِهم لَيَنْتهُنَّ عَنْ ذلك أو لَتخْطَفُنّ أبْصَارَهُم)[١]. واتە: ئەو خەڵکانە چییانە چاویان بەرزدەکەنەوە بۆ ئاسمان لە نوێژەکانیاندا؟ یان ئەوەتا واز لەو کارە دێنن یان خۆیان نامادە بکەن بۆ کوێر بوون.

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (إنّ الله أمَرَكُم بالصلاة، فإذا صَلّيتُم فَلاَ تَلتَفتُوا، فإنّ اللهِ يَنْصِب وَجْهه لِوَجه عَبْده في صَلاتِه، مالَم يَلْتفِت..)[٢] . واتە: خوای گەورە فەرمانی پێ کردوون بە نوێژ کردن، لە نوێژدا ئاوڕمەدەنەوە، چونکە خوای گەورە رووی بەزەیی لە بەندەکەیەتی تا ئەو بەندەیە ڕوویکاتە خوا و ئاوڕ نەداتەوە..

٤- نوێژ کردن بەرامبەر وێنە و زەخرەفەی ڕەنگا و ڕەنگ: عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە بەرگێکی ڕەنگاو ڕەنگدا نوێژی دەکرد، کاتێك لە نوێژەکەی بویەوە فەرمووی: (ئەم بەرگە بەرنەوە بۆ ئەبو جوهم و، بەرگێکی سادە بۆ من بهێنن، چونکە خەیاڵی بردم لە نوێژدا)[٣].

* ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) پەردەیەکی ڕەنگاو ڕەنگی لە دیواری ژوورەکەیدا هەڵیواسی بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی عائیشە! ئەم پەردە ڕەنگاو ڕەنگە لابە، چونکە وێنەکانی ناوی دێنە بەر چاوم لە کاتی نوێژدا، واتە خشوعەکەم ناهێڵن و خەیاڵم بەلایاندا دەچێت[٤].

٥- لاوازی خۆشەویستی و برایەتی لەبەر خوا: چوونە بەهەشت بەستراوە بە خۆشەویستییەوە لەبەر خوا، خشوع ڕێگای چوون بەرەو بەهەشتە، خشوع و بەهەشتیش

---

(١) أخرجه البخاري: (٧٥٠).

(٢) رواه البخاري ومسلم، صحيح جامع الترمذي: ٥/١٤٨ برقم ٢٨٦٣.

(٣) أخرجه البخاري: (٣٧٣) ومسلم: (٥٥٦).

(٤) أخرجه البخاري: (٣٧٤).

بەندن بە بەهێزی خۆشەویستییەوە لەبەر خوا: (وَالَّذي نفسي بِيَده لاَتدْخُلونَ الجَنّة حتى تؤمنوا، وَلاَتؤمِنُوا حتّى تحابُوا، أَوَلاَ أدُلُّكُم عَلى شَيءٍ إِذا فَعَلْتُموهُ تَحابَبْتُم؟ أفشوا السلامَ بَيْنَكُم)[1] واتە: بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ناچنە بەهەشتەوە تاکو ئیمان نەهێنن ئیمانیشتان تەواو نابێ هەتا یەکترتان خۆش نەوێت، شتێکتان نیشان بدەم ئەگەر ئەنجامی بدەن ئەوا یەکترتان خۆش دەوێ، سەلام لە یەکتر بکەن.

٦- بێ ئاگایی و شوێن کەوتنی هەوا و هەوەس و ئارەزوو.

٧- زۆر سەرقاڵ بوون بە دنیاوە و گرنگی پێدانی.

٨- تەرکی جەماعەت و مزگەوت، چونکە گورگ مەڕی تەنها دەخوات.

٩- ڕێك ڕانەوەستان لە ڕیزی نوێژدا و پاڵ نەدان بەیەکەوە.

١٠- زوڵم و ستەم کردن لە بەندەکانی خوا و پێشێل کردنی مافەکانیان.

# فەزڵی نوێژی جومعە

نوێژی جومعە کۆبونەوەی موسوڵمانانە هەفتەی جارێك پێکەوە بۆ زانینی کاروباریان و خۆشەویستی و برایەتی زیاتر خستنە نێوانیان.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِىَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوْمِ ٱلْجُمُعَةِ فَٱسْعَوْاْ إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ وَذَرُواْ ٱلْبَيْعَ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ الجمعة: ٩. واتە: ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوە کاتێك بانگدرا بۆ نوێژی جومعە، ئێوە بە پەلە بچن بەدەم یادی خواوە و واز لە کڕین و فرۆشتن بهێنن، چونکە ئا ئەوە چاکتر و باشترە بۆ ئێوە ئەگەر بزانن و تێ بگەن.

١- سورەتێکی بەناوەوەیە لە قورئاندا بەناوی (سورة الجمعة).

٢- ڕۆژی جومعە لە نێوان پێنج شەممە و شەممەدایە، تایبەتە بە ئوممەتی پێغەمبەرەوەﷺ، خوای گەورە گاور و جوەکانی پێ گومڕاکرد، جولەکە ڕۆژی شەممەیان

---

(١) أخرجه مسلم: (٥٤).

هەبوو، گاورەکان رۆژی یەك شەممە، ئەوان دەبێ شوێن ئێمە بکەون لە کاتێکدا چەندەها ساڵ لە پێش ئێمەوە بوون، ئەمەش لە فەزڵ و خێری ئەم ئوممەتەیە[1].

٣- پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (خَيْرُ يَوْمٍ طَلَعَت عَلَيه الشَّمْسَ يَوْمُ الجُمعَة، فيه خُلِقَ آدَم، وَفيهِ أُدْخِلَ الجَنّةَ، وفيهِ أُخرِجَ مِنْها)[2]. واتە: باشترین رۆژی هەفتە کە خۆری لێ هەڵبێ جومعەیە، خوای گەورە لە رۆژی جومعەدا ئادەمی دروستکرد، لە ڕۆژی جومعەدا چووە ناو بەهەشتەوە، هەر لەو رۆژەشدا لە بەهەشت دەرکرا و خرایە سەر ئەم زەوییە.

٤- ئیبن عەباس (ڕەزای خوایان لێ بێ )فەرمووی: پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: (إنّ هذا يَوْمُ عيد جَعَلَهُ اللهُ للمُسْلمين، فَمنْ جاءَ الى الجُمعة فَلْيَغتَسِلْ، وَإن كان عِندَهُ طيبُ فَلْيَمسَ مِنْهُ وَعَلَيكُم بسِواك)[3]. واتە: خوای گەورە رۆژی جومعەی گێڕاوە بە جەژن بۆ موسڵمانان، هەرکەسێك هات بۆ نوێژی جومعە باخۆی بشوات، ئەگەر بۆنی خۆشی لابوو با لەخۆی بدات، سیواکیش بکەن.

* هەروەها فەرمووی: بەکۆمەڵێ موسڵمان لە رۆژی جومعەدا: (مَعاشِر المُسْلمين إنّ هذا يَومٌ جَعَلَهُ اللهُ لَكُم عِيداً، فَاغتَسِلوا و عَلَيْكُم بالسِواك)[4]. واتە: ئەی کۆمەڵی موسڵمانان، ئەم ڕۆژە خوا کردوویەتی بە جەژن بۆتان، خۆتان بشۆن و سیواك بکەن.

٥ـ عوبەیدەی کوڕی جەراح فەرمووی: پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: (مَامِن الصَّلوات صَلاة أَفْضَلُ مِن صَلاَةِ الفَجرِ يَوْمِ الجُمعَةِ فِي الجماعة، وَمَا أَحسبُ مَن شَهِدَ ها مِنْكُمْ إلاّ مَغْفُوراً لَهُ)[5]. واتە: باشترین نوێژ لای خوا نوێژی بەیانی ڕۆژی جومعەیە بە جەماعەت، هەر کەسێك لە ئێوە بەشداری بکات هیوادارم خوا لێی خۆشبێت.

---

(١) رواه البخاري: (٨٣١).

(٢) رواه مسلم: (٤٨٦).

(٣) أخرجه ابن ماجه: (١٠٩٨) في اقامة الصلاة.

(٤) أخرجه الطبراني في الأوسط: (٣٤٣٣) والصغير: (٣٥٩) وذكر هيثمى (٢/ ١٧٢).

(٥) البزار: (٦٢١)، والطبراني: (١٨٦)، والهيثمى: (٨/ ١٦٨)، وابونعيم: (٧١/ ٢٠٣).

* هەروەها فەرموویەتی: (إنَّ أفْضَل الصَلوات عِندَ اللهِ صَلاَةُ الصبح يَومُ الجُمعَة فِي الجماعَةَ)[1]. واتە: باشترین نوێژ لای خوا نوێژی بەیانی ڕۆژی جومعەیە بە جەماعەت.

٦-تەنها دوو ڕکات نوێژی فەرز دەکرێ بەڵام لە ڕۆژەکانی تردا چوار ڕکات دەکرێت.

٧- (الجَهْرُ فيها) نوێژەکەی بەدەنگی بەرز و ئاشکرا دەخوێنرێت.

٨- سەرقاڵ بوون بەعیبادەتەوە تا ئیمام لەمزگەوت دەچێتە دەرەوە خێرێکی گەورەی هەیە.

٩- خوێندنی سورەتی جومعە و مونافقین سوننەتن لە نوێژی عیشای شەوەکەیدا.

١٠- لە ڕۆژی جومعەدا سزا لە سەرخەڵکانی بەرزەخ هەڵدەگیرێت.

١١- هەڕەشە کراوە لەوانەی کە دوا دەکەون یان ئامادەی جەماعەتی جومعە ناکەن بە سوتاندنی ماڵەکانیان بە سەریاندا[2].

١٢- مۆر دەنرێ بەسەر دڵی ئەوکەسانەدا کە واز لە نوێژی جومعە دەهێنن بەبێ بەهانەی شەرعی، بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیە: (لَيَنتَهِنَّ أقوامٌ وَدْعهم الجُمعات، أو ليختِمَنَّ اللهُ عَلى قُلُوبِهِم ثمَّ لَيكونَنَّ مِن الغافلين)[3].

* هەروەها دەفەرموێت: (مَنْ تَرَكَ ثلاث الجُمْعَة مِن غَيرِ ضرورةٍ طَبَعَ اللهُ على قلبِهِ)[4]. واتە: هەرکەسێ سێ جومعە لەسەریەك بەبێ ئیش و کارێکی زۆر زەروور بەهانەیەکی شەرعی و پێویست واز لە نوێژی جەماعەتی جومعە بهێنێ ئەوە خوای گەورە مۆر دەدات لەسەر دڵی.

١٣- ڕۆژوو گرتن تێیدا دروست نییە بە تەنها، یان دەبێ ڕۆژی پێشتر یان ڕۆژی دواتری لەگەڵدا بگیرێ[5].

١٤- نابێت تایبەت بکرێ بۆ شەونوێژ کردن [1].

---

(١) رواه البيهقي في الشعب: (٣٠٤٥).

(٢) رواه حاكم في المُستدرك (١/ ٢٩٢) وصحيحه على شرط شيخين.

(٣) أخرجه مسلم: (٨٦٥)، والبغوى: (١٠٥٤).

(٤) رواه الترمذى: (٥٠٠)، وأبوداود:(١٠٥٢)، و أحمد: (٣/ ٤٢٤)، وحاكم: ٣/ ٦٢٤.

(٥) أخرجه البخاري: (١٩٨٥)، ومسلم: (١١٤٤).

١٥- لەكاتی وتاردا نابێ کەس قسە بکات دەبێ بەبێ دەنگی گوێ بۆ ئیمام ڕابگیرێت.

* پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (هەرکەسێك لە ڕۆژی جومعەدا دەسنوێژێکی ڕێك و پێك بگرێ و بێت بۆ جەماعەتی جومعە بەبێ دەنگی گوێ بگرێ بۆ وتاری ئیمام خوای گەورە لە گوناهی نێوان ئەو جومعە و جومعەکەی پێشوی خۆش دەبێ لەگەڵ سێ ڕۆژی زیادەدا، هەرکەسێ دەست بدات لە بەرد و خۆی مەشغوڵ بکا ئەوە شتی نابەجێی کردووە و خۆی بەشتی بێ هوودەوە خەریك کردووە.

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (إذا قُلتَ لِصاحِبكَ أَنصِت يوم الجمعة، والإمام يخطب فقد لَغَوتَ)[٢]. واتە: لەکاتی وتاری هەینیدا ئەگەر بڵێی بە هاوەڵەکەت بێ دەنگ بە ئەوە خۆت بەشتی پڕوپوچەوە خەریك کردووە، خێری جومعەکەت نامێنێ.

١٦- خۆشتن پێویستە: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (مَنْ جاءَ مِنكُم الجُمعَةَ فَلْيَغسِلْ)[٣]. واتە: هەرکەسێك هات بۆ نوێژی جەمعە با خۆی بشوات.

هەروەها دەفەرموێت: (غُسْل الجُمعة وَاجِبٌ عَلى كُلِّ مُحتَلِم)[٤]. واتە: خۆشتن لە ڕۆژی جومعەدا واجبە لەسەر هەموو موسڵمانێکی بالغ.

١٧- خێری گەورە دەست ئەوکەسە دەکەوێ پێش وەخت ئامادە دەبێ: (من اغتسل يوم الجمعة غسل الجنابة ثم راح، فكأنما قرب بدنة، ومن راح في الساعة الثانية، فكأنما قرب بقرة، ومن راح في الثالثة، فكأنما قرب كبشا أقرن، ومن راح في الساعة الرابعة، فكأنما قرب دجاجة، ومن راح في الساعة الخامسة، فكأنما قرب بيضة، فإذا خرج الإمام حضرت الملائكة يستمعون الذكر)[٥]. واتە: هەرکەسێك ڕۆژی جومعە خۆی بشوات و پاشان لە سەعاتی یەکەمدا ئامادەبێ لە مزگەوتدا وەك وشترێ بکات بەخێر ئاوایە، ئەوەی لە

---

(١) أخرجه مسلم: (١١٤٤) (١٤٨).

(٢) أخرجه البخاري: (٩٣٢)، ومسلم: (٨٥١).

(٣) أخرجه البخاري: (٨٩٤)، ومسلم: (٨٤٤) في الجمعة، عن ابن عمر.

(٤) أخرجه البخاري: (٢٦٦٥)، ومسلم: (٨٤٦) في الجمعة، عن أبي قتادة.

(٥) أخرجه البخاري: (٨٨٨) (٨٤١)، ومسلم: (٨٥٠).

سەعاتی دووەمدا بڕوات وەك ئەوە وایە مانگایەك بكات بەخێر، ئەوەی لە سەعاتی سێیەمدا بڕوات وەك ئەوە وایە بەرانێكی شاخدار بكات بەخێر، ئەوەی لە سەعاتی چوارەمدا بڕوات وەك ئەوە وایە مریشكێ بكات بەخێر، ئەوەی لە سەعاتی پێنجەمدا بڕوات وەك هێلكەیەك بكات بەخێر وایە، كە ئیمام چووە سەر مینبەر ئیتر ملائیكەكان دەڕۆن گوێ لە وتارەكەی دەگرن ئەوەی لە دوای ئەوە بڕوات ناوی لە دەفتەری ڕیز لێنانی ئەوانەدا نانوسرێ چونكە سجیلەكەیان پێچاوەتەوە.

١٨- بۆ هەموو هەنگاوێك پاداشتی ساڵێ دەنووسرێت: ئەوسی كوڕی ئەوسی سەقەفی فەرموی: بیستم لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو:(من غسَّلَ یَومَ الجُمعَة وأغسلَ، ثُمَّ بَكَّرَ وَابتَكرَ، وَمَشى وَلَم يَرْكب، ودنا مِن الإمام، وَاسْتَمع و لم يَلغُ، كان لَهُ بِكُل خُطوةٍ عَمَلُ سَنة أجْرُ صِيامِها و قِيامِها)[1]. واتە: هەر كەسێك لە ڕۆژی جومعەدا خۆی بشوات و پێش وەخت ئامادە بێت بۆ نوێژ، بە پیادە بڕوات نەك بە سواری، لە نزیك ئیمامەوە دانیشێت، بەبێ دەنگی قسەی نابەجێ نەكات، بۆ هەموو هەنگاوێكی خێر و پاداشتی ساڵێك شەونوێژی بۆ دەنوسرێت كە لە ڕۆژەكەیدا بە ڕۆژوو بوو بێت.

١٩- خوێندنی سورەتی (الكهف) دەبێتە نوور و ڕووناكی نێوان ئەو جومعە و جومعەكەی تر: ئەبو سەعیدی خودری فەرمووی: پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: (مَنْ قَرأَ سورة الكَهف يَومُ الجُمعه أَضَاءَ لَهُ مِنَ النور مابين الجمعتين)[2].

٢٠- نوێژی جومعە دەبێتە هۆی كەفارەت و شۆردنەوەی گوناهەكان: ئەبو هورەیرە فەرمووی: پێغەمبەری خوا فەرمویەتی: (الجُمعة الى الجُمعة كفارةٌ لِما بَينَها مَالَم تَغْشَ الكبائِر)[3]. واتە: جومعە بۆ جومعەیەكی تر دبێتە هۆی شۆردنەوەی گوناه وتاوانی نێوانیان بەمەرجێ لە تاوانە گەورەكان نەبن.

٢١- كاتێكی تێدایە دوعای تێدا گیرایە ئەوكاتەش دیاری كراو نییە، لەبەر ئەوە موسڵمانان پاڕانەوەی زۆری تێدا بكەن، هەركەسێ لەوكاتەدا داوای هەرچییەك بكات لە

---

(١) أخرجه ابوداود: (٣٤٥) وابن ماجه:(١٠٧٨) والبغوي: (١٠٦٥) وإسناد صحيح.

(٢) رواه النسائي: (٩٥٢)، والبيهقي: (٢٤٤٦) والحاكم: (٢٠٧٢ ) وهو حديث صحيح.

(٣) صحيح مسلم: (٢٣٣) وابن ماجه: (١٠٨٦).

خوای گەورە پێی دەبەخشێ: (فِيهَ سَاعَةَ لاَ يُوا فِقَها عَبدٌ مَسْلمٌ وَهوَ قَائِمٌ يُصَلِّي يسأَلَ اللهَ شَيئاً إلا أعطاهُ إياهُ وأَشار بيدهِ يُقَلِلُها)[1].

٢٢- ئەوسی کوڕی ئەوس سەقەفی فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: (فأَكثِروا مِنَ الصَّلاة عليَّ فِيهِ فَإِنَّ صَلاتَكُم مَعْرُوضَةٌ)[2]. واتە: زۆر سەلاوات بدەن لەسەرم لە شەو و رۆژی جومعەدا چونکە پێم دەگات.

٢٣- رۆژی جومعە چەندەها تایبەتمەندی هەیە،بەڵام شەممە و یەك شەممە هیچ تایبەت مەندییەکیان نییە[3].

## ڕۆڵی مزگەوت :

مزگەوت ئەو شوێنە پیرۆزەیە لە شەو و رۆژێکدا پێنج جار نوێژی تێدا ئەنجام دەدرێت، قوتابخانەیە بۆ بانگەواز و بڵاوکردەوەی ئایینی ئیسلام، کۆڕی زانست و زانیاری لە مزگەوتدا دەبەسترا، بۆیە ئەو هەموو کەڵە زانا و خواناسانەی پێگەیاندوو پەروەردەی کردن، خەڵك لە مزگەوتدا فێری عەقیدە و بیروباوەڕ، بەندایەتی، فەرزەکان، سوننەتەکان، ئەخلاق و ئاکاری بەرز دەبوون..

مزگەوت شوێنی هەواڵ زانینی یەکترە، شوێنی چارەسەرکردنی کێشە و گرفتی موسڵمانانە، کەواتە مزگەوت رۆڵێکی گرنگی هەیە لە ژیانی موسوڵماناندا.

مزگەوت نابێ بکرێتە تەمەڵخانە، چونکە شوێنی بێکار و تەمەڵەکان نییە، ئەشکەوت نیە بۆ رەهبانەکان، شوێنی پیر و پەککەوتەکان نییە، شوێنی تەقوا و خواپەرستییە..

پێغەمبەری خوا ﷺ یەکەم شت بیری لێکردەوە مزگەوت بوو، کاتێك کە ماوەیەکی کەم لای خێڵی سالمی کوڕی عەوف مایەوە لە رێگەی کۆچکردنی بۆ مەدینە، ئەوەبوو

(١) صحيح البخاري: (٦٤٠٠)، و مسلم: (٨٤٢).

(٢) رواه ابوداود: ١٠٧٤، وابن ماجه: ١٠٨٥، والحاكم: ١ / ١٢٧٨ و وافقه الذهبـي.

(٣) زاد المعاد، لإبن القيم : (١/ ٣٦٤).

مزگەوتی قوبائی دروستکرد خوای گەورەش ئەم ئایەتەی بەو بۆنەیەوە دابەزاند:﴿لَّمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى ٱلتَّقْوَىٰ مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِ ۚ فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُوا۟ ۚ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُطَّهِّرِينَ﴾ التوبة: ١٠٨. واتە: بێگومان مزگەتێك كە لەسەر بناغەی تەقوا و لە خواترسان دامەزرابێت لە یەكەم رۆژەوە شایەنترە نوێژی تێدا بكەیت، پیاوانێكی تێدایە پێیان خۆشە كە خۆیان پاك راگرن، خوایش ئەوانەی زۆر پاك و خاوێنن خۆشی دەوێن.

هەروەها خوای گەورە مەدحی ئەوانە دەكات لە مزگەوتی قوباء، مزگەوتی پێغەمبەردا ﷺ بوون بەهۆی سوربوونیان لەسەر پاك و خاوێنی دڵ و دەروونیان و جل و بەرگ و مزگەوتەكانیشیان.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی كردووە بە موسڵمانان كە خۆیان برازێننەوە لە مزگەوتەكاندا، بۆنی خۆش لە خۆیان بدەن، جل و بەرگی پاك و خاوێن لەبەربكەن، سیواك بكەن و، دووربكەونەوە لە بۆنی ناخۆش و جل و بەرگی پیس و چڵكن لەبەركردن.

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿يَٰبَنِىٓ ءَادَمَ خُذُوا۟ زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ﴾ الأعراف: ٣١. واتە: ئەی نەوەی ئادەم خۆتان برازێننەوە بە پۆشاك و جلی جوان لەبەركردن، لە كاتی هەموو نوێژ و چوونە مزگەوتێكدا..

ئیمام حەسەن (بە رەحمەت بێ) كاتێك دەچوو بۆ نوێژ چاكترین و پاك و خاوێنترین جل و بەرگی لەبەر دەكرد، لێیان پرسی لەو بارەوە؟. فەرمووی:(إنَّ اللهَ جميلٌ يُحبُّ الجَمالَ). منیش پێم خۆشە خۆم جوان بكەم لە حوزوری پەروەردگارمدا.

خوای گەورەش پێی خۆشە جل و بەرگتان جوان بێ و پاك و خاوێن بێت پێڵاوی جوان لە پێ بكەن و سیمایشتان جوان بێ.

* پێغەمبەری خوا ﷺ دوای ئەوە گەیشتە مەدینە و حەوایەوە یەكەم شت پێی هەستا دروستكردنی مزگەوتەكەی خۆی بوو، خۆی ئیشی تێدا دەكرد! بەدەستی خۆی بەردی هەڵدەگرت و دەیگوێزایەوە و دەیفەرموو:

أللهُمَّ لاعَيشَ إلا عيش الآخِرة فاغفر لِلانصار و المُهاجِرَة

ئەو مزگەوتەی پێغەمبەر ﷺ بوو بە یەكەم قوتابخانەی بانگەوازی ئیسلام، ماڵی

دەوڵەتی ئیسلام بوو. دەرگای هەمیشە کراوە و لەسەر پشت بوو بۆ هەموو میللەتان، عەرب، کورد، فارس و، هەموو نەتەوەکانی تری دنیا.. بۆ هەموو جۆرە رەنگێ سپی و رەش، بۆ هەموو جۆرە پلەو پایەیەك فەقیر و دەوڵەمەند، دەسەڵاتدارو بێ دەسەڵات، بۆ هەموو جۆرە تەمەنێك پیرو گەنج. دەرگای لەسەر پشت بوو بۆ ئافرەتان بۆ نوێژکردن و فێربوونی زانیاری شەرعی، لە سەردەمێکدا ئافرەت حەقی نەبوو کە فێری زانیاری ببێ، نە ئەبوو بەشداری پیاو بکات لە ژیاندا.

مزگەوت بوو بە قوتابخانەیەك زانیاری و کردەوەی چاکی تێدا فێردەکرا روح و جەستەی تێدا پاك دەکرایەوە، حەق و واجبی تێدا دەناسرا، پەروەردەی پێش فێربوون تێدا دەکرا، شوێنی کردەوە بوو پێش نەزەری وەرگرتن، شوێنی پاك بوونەوەی نەفس بوو لە چڵك و چەپەڵی تاوان و خراپە، شوێنی کۆبوونەوەی موسڵمانان بوو لەشەو و رۆژێکدا پێنج جار، بۆیە ئەو کەڵە پیاوانەی هەڵخست، ئەو ئەستێرە درەوشاوانەی کە هەتا هەتایە دەدرەوشێنەوە لە ئاسمانی مرۆڤایەتیدا پەروەردەکرد.

لە خەلیفە راشیدەکان: ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان و علی (رەزای خوایان لێ بێ).

لە سەرکردە و پێشەواکان: ئەبو عوبەیدە و خالید و عەمر (رەزای خوایان لێ بێ).. لە قورئان خوێنەکان: وێنەی زەیدی کوڕی ثابت و ئیبن و عەباس..

لە ئافرەتە خاوەن فەزڵ و چاکەکان: وێنەی فاتیمەی کچی پێغەمبەری خوا ﷺ و، عایشەی کچی ئەبوبەکر دایکی ئیمان داران و حەفصە و دایکی عمار و دایکی سولەیم..

بەڵێ مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ شوێنی بانگەواز بوو، ماڵی دەوڵەتی ئیسلام بوو بۆ راپەڕاندنی کاروبارەکان، ئیشی تێدا دەدۆزرایەوە بۆ بێکارەکان، نەخوێندەواری تێدا فێری زانست و زانیاری دەکرا، یارمەتی فەقیر و هەژاری تێدا دەدرا، چاوپێکەوتنیان لەگەڵ سەفیری وڵاتان دەکرد لە مزگەوتدا، بانگی جیهاد و تێکۆشانی تێدا دەدرا، پەروەردە و مەشقی سەربازی تێدا دەکرا، لەوێوە نوێنەر بەرێ دەکرا بۆ وڵاتان.

لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی و شوێن کەوتووانی ئەوانیشدا رۆڵی مزگەوت ئابەو شێوەیە بووە.

خەڵکی حەبەشە یاریان کردووە بە (حیراب)ەکانیان لە مزگەوتدا و پێغەمبەری

خواﷺ سەیری کردوون، عائیشەش یاریەکەیانی دەبینی[1].

عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لێ بێ) وردە بەردی بۆ هەڵگرتن ویستی بیکێشێ پێیاندا و دەریان بکات بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (وازیان لێ بێنە ئەی عومەر!).

خەڵك شەو و ڕۆژ لە مزگەوتدا کۆدەبوونەوە، لە گەرما و سەرمادا، لە هاوین و زستاندا، ماڵێکە هەموو کەس بەبێ کرێ دەچێتە ناوی..

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (مَن بنى مَسجِداً لله بنى الله لَه في الجنة مِثله)[2]. واتە: هەر کەسێك مزگەوتێك بونیاد بنێ لە بەر ڕەزامەندی خوا ئەوا خوای گەورە ماڵێکی لە بەهەشتدا بۆ بونیاد دەنێت.

مەحوی شاعیری خواناس دەڵێت:

مـــاڵی ئـــاوا ئـــەو کەســـەی مـــاڵی تـــۆ ئـــاوا دەکـــا

عەبـــدی خۆتـــە و خـــۆت دەزانـــی چـــی لـــە تـــۆ داوا دەکـــا.

دروست نییە مزگەوت زیاد لە حەد بڕازێنرێتەوە چونکە لە کردەوەی گاور و جوەکانە، نابێت مامەڵەی تێدا بکرێت، تف و پیسی تێ ڕۆبکرێت، دەنگی تێدا بەرز بکرێتەوە، پێویستە زۆر گرنگی بدرێت بە پاك و خاوێنی..

مزگەوت ڕێگای بەختیارییە، شوێنی کۆبونەوەی موسڵمانان و یەکتر ناسینە، شوێنی خۆشەویستی و برایەتییە، کە بەبێ ئەو دوانە زەحمەتە موسڵمانان سەرفراز و سەرکەوتوو بن، ڕێگای چونە بەهەشت و ئیمانە: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (وَالّذي نَفسي بِيَدِه، لاتَدْخُلوا الجَنَّةَ حَتّى تُؤمِنُوا، وَلا تُؤمِنوا حَتّى تحابُّوا، أولاأَدُلُّكُم عَلى شئٍ إذا فَعَلْتُمُوهُ تَحابَبْتُم؟ أَفْشَوا السَلامَ بَيْنَكُم)[3]. واتە: بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە کە خوایە، ناچنە بەهەشتەوە هەتا ئیمان نەهێنن، ئیمانیشتان تەواو نییە تا یەکتریتان خۆش نەوێ، شتێکتان نیشان دەم ئەگەر کردتان یەکتریتان خۆش بوێ؟ سلاو لە یەکتر بکەن.

---

(١) رواه البخاري .

(٢) البخاري: (٤٥٠)، ومسلم: (٥٣٣).

(٣) أخرجه مسلم: (٥٤) عن أبي هريرة (رضي الله عنه).

ژیانی موسڵمان پەیوەستە بە مزگەوتەوە، بە شێوەیەك کە بەبێ مزگەوت نایکرێ و ژیانی بەختەوەر نابێ، هەست بە برایەتی و خۆشەویستی و یەکسانی ناکات.. لەم سەردەمە پڕ لە نەهامەتیەدا ئەو هەموو بەربەرەکانێ و راکردنە بەدوای ژیانی دنیا، ئەو هەموو بەڵا و ناسۆرەی کە هەیە، موسڵمان رۆژی پێنج جار دەچێتە مزگەوت ئەو برایەتی و ئازادی و یەکسانییە دەبینێ بە چاوی خۆی، کە دوازدە سەدە پێش شۆڕشی فەرەنسا مزگەوت بە کردەوە و بە ڕاستی ئەو ڕۆڵەی بینیوە.

چ سەربەستییەك لەوە گەورەترە کە لە مزگەوتدا هەر هەمووی عیبادەت بۆ یەك خوا دەکەن، بەیەکەوە رکوع و سەجدەی بۆ دەبەن، هەر هەموویان ترسیان هەیە لە خوا و گەردنکەچن بۆی، چەندە بەشەر گەورە بێت لە مزگەوتدا هەر بەندەیە وەك ئەو هەموو بەندانەی تر کە خواپەرستی دەکەن.﴿ وَأَنَّ ٱلْمَسَـٰجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدْعُوا۟ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدًا ﴾الجن: ١٨.
واتە: بێگومان مزگەوتەکان تایبەتی خوان، کەواتە لەگەڵ خوادا هاوار لە کەسی تر مەکەن.
ئەگەر ئیمام هەڵەیەکی کرد نوێژخوێنان لەدواوە یەکسەر بۆی راست دەکەنەوە، شێخ و مەلاو کرێکار یەکسانن و بەیەك ریز رادەوەستن ئەوە نییە بڵێن دەوڵەمەندەکان و دەسەڵاتدارەکان با لەپێشەوە بن و فەقیر و هەژارەکان با لەدواوە بن!..

چ یەکسانیەك لەوە گەورەترە کە دەوڵەمەند لەتەنیشت فەقیرەوە رادەوەستێ لە نوێژدا، دەسەڵاتدار لە پاڵ بێ دەسەڵاتدا، هەر هەموو نوێژخوێنان وەك دانەکانی شانە یەك یەك رێك رادەوەستن بەبێ جیاوازی!.

چ برایەتییەك لەوە بەهێزترە کە خەڵکی گەڕەکێ رۆژی پێنج جار لەیەك کاتدا مزگەوت کۆیان دەکاتەوە، لەشیان بەر لەشی یەکتر دەکەوێ چاویان بە یەکتر دەکەوێ، تەوقە لەگەڵ یەکتر دەکەن، گفتوگۆ دەکەن بەیەکەوە، لەدوای یەك ئیمامەوە نوێژ دەکەن، لە یەك خودا دەپاڕێنەوە کە ئەویش (الله)یە، یەك پێغەمبەریان هەیە، روویان لە یەك قیبلەیە، یەك قورئان دەخوێنن، بەیەکەوە رکوع و سەجدە دەبەن، هەستان و دانیشتنیان پێکەوەیە.

* سوننەتەکاتی چوونە مزگەوت قاچی راست پێش بخرێت و سڵاوات بدرێ لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ و بوترێت: (اللهم! افتح لي أبواب رحمتك)، کاتی هاتنە دەرەوەش پێی چەپ پێش بخرێت و بوترێت: (اللهم! إني أسألك من فضلك)[1].

# فەزڵی رۆشتن بۆ مزگەوت

رۆشتن بۆ مزگەوت دەبێتە هۆی پتەوی ئیمان و، ئیماندار پلەی بەرز دەبێتەوە پێی لای خوای گەورە، دڵی خۆش دەبێت، دەبێتە نور و رووناکی بۆی لە قیامەتدا..

١- ئەبو هوریرە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (مَنْ غَدَا إِلَى الْمَسْجِدِ وَرَاحَ أَعَدَّ اللَّهُ لَهُ نُزُلَهُ مِنَ الْجَنَّةِ كُلَّمَا غَدَا أَوْ رَاحَ)[2]. واتە: هەرکەسێك بەیانیان یان ئێواران بڕوات بۆ مزگەوت بۆ نوێژ، خواردنێ کە لایەق بە میوان بێ خوای گەورە لە بەهەشتدا بۆی ئامادە دەکات.

٢- پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (قال من تَطَهَّرَ فى بَيتِه، ثُمَّ مَشى الى بيتٍ مِن بيُوتِ اللّه، لِيَقضى فَريضَةً مِنْ فَرائضِ اللّه، كَانَتْ خُطوَاتُهُ، إحداها تَحطُّ خَطيئةً، وَالْأخرى تَرْفَعُ دَرَجَةً)[3]. واتە: هەرکەسێ لە ماڵەوە خۆی پاك بکاتەوە و دەستنوێژ بگرێت و بڕوات بۆ ماڵێ لە ماڵەکانی خوا، بۆ ئەوەی فەرزێ لە فەرزەکانی خوا بەجێ بێنێ ئەوە هەر هەنگاوێك دەنێ گوناهێکی هەڵدەوەرێ، بە هەنگاوەکەی تری پلەیەك لای خوا بەرز دەبێتەوە.

٣- ئەبوهورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (صَلاَةُ الرَجُلِ فِي الجَماعَةِ تُضعَّف على صَلاتِه فِي بَيتِهِ وَسوقِه خَمْسَاً وَعَشْرينَ دَرَجَةً، وَذلكَ أَنَّهُ إذا تَوَضَأَ فأحْسَنَ الوضوءَ ثُمَّ خَرَجَ إلى المَسجد لايُخرجُهُ إلاّ الصَّلاَةَ لَمْ يَخطُ خطوَةَ إلارُفِعَت لَهُ بِها دَرَجَة، وَحُطَّ عَنْهُ بِها خَطيئة، فَإذا صَلّى،لَم تَزَل الملائكه تُصَلّى عَلَيهِ، مَادَامَ فِي مُصلاَّهُ: اللهُمَّ صَلِّ عَلَيهِ، اللّهُمَ ارْحَمْهُ، ولايزال فى الصَلاةِ مَا أنْتَظِرِ الصَّلاة)وفي رواية:

(١) أخرجه مسلم: (٧١٣)، وأبو داود: (٤٥٦)، صحيح، الجامع الترمذي: (١٢٧/٢).

(٢) أخرجه البخاري في الآذان (٢٨٥) (٦٦٢)، تحفة ١٤٢١٧، مسلم في المساجد (٢٨٥).

(٣) أخرجه المسلم في المساجد: (٢٨٢)، والبيهقي في السنن: (٣/ ٦٢).

(اللّهُمَّ اغْفِر لَهُ، اللّهُمَ تُبْ عَلَيهِ، مالَم يؤذِ فيه..) [1]. نوێژی پیاوێ له ئێوه به جه‌ماعه‌ت بیكات له مزگه‌وتدا، خێری بیست و پێنج پله‌ی نوێژی ماڵ و بازاڕی هه‌یه، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ئه‌گه‌ر له‌ماڵه‌وه ده‌ست نوێژێكی ڕێك و پێكی گرت و، چوو بۆ مزگه‌وت ته‌نها بۆ نوێژ كردن بڕوات هه‌ر هه‌نگاوێك كه ده‌ینێ خێرێكی بۆ ده‌نوسرێ، هه‌نگاوه‌كه‌ی تریشی گوناهێكی ده‌شواته‌وه، ئه‌گه‌ر چووه مزگه‌وت و نوێژی كرد، به‌رده‌وام مه‌لائیكه سڵاواتی له‌سه‌ر ده‌ده‌ن هه‌تا له شوێنی نوێژه‌كه‌ی بمێنێته‌وه، ده‌ڵێن خودایه ره‌حمه‌ت بڕێژه به‌سه‌ریدا، خوایه به‌زه‌یت پێیدا بێته‌وه، به‌رده‌وام به نوێژ بۆی حسابه مادەم چاوه‌ڕوانی نوێژ ده‌كات.له ریوایه‌تێكی تردا فه‌رموویه‌تی: ده‌ڵێن خودایه لێی خۆشبه، خودایه ته‌وبه‌ی لێ قبوڵ بفه‌رموو، به‌مه‌رجێ ئازاری كه‌س نه‌دات.

٤- عه‌بدولاّی كوڕی عومه‌ر (ره‌زای خوایان لێ بێ) فه‌رمووی: پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رموویه‌تی: (مَن رَاحَ إلى المَسْجِدِ الجَماعَة فَخَطوَةٌ تَمحُوا سَيئةً، وخُطوَةٌ تكتب لَهُ حَسَنة، ذاهِباً أوَ راجِعاً) [2]. ئه‌و كه‌سه‌ی بڕوات بۆ مزگه‌وت بۆ نوێژی جه‌ماعه‌ت، به هه‌نگاوێكی گوناهێكی هه‌ڵده‌وه‌رێ، به‌وی تریشی پله‌یه‌ك به‌رز ده‌بێته‌وه، ڕۆشتن و گه‌ڕانه‌وه‌ش وه‌ك یه‌كن، هه‌مان پله‌و پایه‌یان هه‌یه بۆ هه‌موو هه‌نگاوێك.

٥- پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ ده‌فه‌رموێت: (بَشِّر المَشّائين في الظُلَم الى المَساجِد، بالنورِالتامِّ يَومَ القيامَة) [3]. واته: مژده بده‌ن به‌و كه‌سانه‌ی له تاریكیدا هه‌نگاو ده‌نێن به‌ره‌و مزگه‌وته‌كان، به ڕووناكی ته‌واو بۆیان له قیامه‌تدا، مه‌به‌ستی له نوێژی عیشا و به‌یانییه.

٦- ئه‌بوهوره‌یره فه‌رمووی: پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ ده‌فه‌رموێت : (أَلاَ أَدُلُّكُمْ عَلَى مَا يَمْحُو اللَّهُ بِهِ الْخَطَايَا وَيَرْفَعُ بِهِ الدَّرَجَاتِ). قَالُوا بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ (إِسْبَاغُ الْوُضُوءِ عَلَى الْمَكَارِهِ وَكَثْرَةُ الْخُطَا إِلَى الْمَسَاجِدِ وَانْتِظَارُ الصَّلاَةِ بَعْدَ الصَّلاَةِ فَذَلِكُمُ الرِّبَاطُ، فَذَلِكُمُ الرِّبَاطُ،فَذَلِكُمُ الرِّبَاطُ) [4] . واته: شتێكتان فێرده‌كه‌م ئه‌گه‌ر كردتان گوناهتان هه‌ڵده‌وه‌رێنێ و

---

(١) أخرجه البخاري في الآذان (٦٤٧)، و مسلم في المساجد (٢٤٩).

(٢) أخرجه أحمد و الطبراني و صححه الألباني في صحيح الترغيب و الترهيب: (٢٩٨).

(٣) أبو داود والترمذي وصححه لغيره الألباني في صحيح الترغيب والترهيب: (٣١٥).

(٤) أخرجه مسلم: (٢٥١) (٦١٠).

پلەتان بەرزدەکاتەوە؟. وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ! فەرمووی: دەستنوێژ گرتن لە کاتی ناخۆشیدا وەك ساردی ئاو، یان ئاوەکە دووربێت، یان لە کاتی باران بارین و نەخۆشیدا، زۆر هەنگاو نان بەرەو مزگەوتەکان، چاوەڕوانی نوێژ لە دوای نوێژ، ئا ئەوەیە سەنگەرگرتن بۆ خەبات و تێکۆشان، ئا ئەوەیە سەنگەرگرتن، ئا ئەوەیە سەنگەرگرتن.

٧- ئەبو موسا فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (أَعْظَمُ النَّاسِ أَجْرًا فِي الصَّلاَةِ أَبْعَدُهُمْ فَأَبْعَدُهُمْ مَمْشًى، وَالَّذِي يَنْتَظِرُ الصَّلاَةَ حَتَّى يُصَلِّيَهَا مَعَ الإِمَامِ أَعْظَمُ أَجْرًا مِنَ الَّذِي يُصَلِّي ثُمَّ يَنَامُ »[1]. واتە: گەورەترین خێرو پاداشت بۆ ئەو کەسەیە ماڵی دوور تربێ لە مزگەوتەوە، چونکە هەنگاوی زیاتر دەنێ، ئەوەی چاوەڕوانی نوێژ دەکات تا لەگەڵ ئیمام نوێژ بکات، خێر و پاداشتی زیاتر دەست دەکەوێت لە کەسێك نوێژەکەی دەکات و لێی دەخەوێت.

٨- عوقبەی کوڕی عامر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (اذ تطهّر الرجل، ثُمَّ أتى المَسجد يَرعى الصلاة كُتِبَ لَهُ كاتباهُ أو كاتبه بكُلِ خُطوَة يَخطوها الى المسجد عَشر حَسنات، والقاعِدُ يرعى الصلاة كالقانت، ويَكتُبُ مِنَ المُصَلين حين يخرج من بَيته حتى يَرجعَ إليه)[2]. واتە: ئەگەر پیاوێك دەستنوێژی گرت و هات بۆ مزگەوت پارێزگاری لە نوێژ کرد ئەوا ئەو مەلائیکەیەی چاکەی بۆ دەنوسێ کە لای ڕاستیەوەیەتی بۆ هەر هەنگاوێکی دە چاکەی بۆ دەنوسێت، ئەوەی دانیشتوە و چاوەڕێی نوێژ دەکات و پارێزگاری لە نوێژ دەکات وەك ئەو کەسەیە بە پێوە بێت و نوێژ بکات، واتە لە ڕیزی نوێژخوێنانە، کاتێك لەماڵ دەردەچێ تا ئەو کاتەی دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەکەی خۆی.

٩- پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (ثلاثة كُلّهم ضَامِن عَلَى الله: إن عاش رزقَ وَكُفي، وَإن مَاتَ أدخلَهُ اللهُ الجَنة: مَنْ دَخَل بَيته فَسَلّم، فَهُوَ ضامنٌ عَلى الله، وَمَن خرج الى المَسجد، فَهُو ضامِنٌ على الله، وَمَن خَرج في سَبيل الله، فَهو ضامِنٌ على الله)[١٣٥]. واتە: خوای گەورە کەفیلی سێ کەس دەکات: بەوەی ئەگەر ژیا ئەوا ڕزق و ڕۆزی و پێویستی بۆ دابین دەکات، ئەگەر مردیش دەیخاتە بەهەشتەوە، یەکێ بڕواتەوە بۆ ماڵەوە و سلاو بکات

---

(١) أخرجه البخاري: (٦٥١) و مسلم: (٦٦٢).

(٢)أخرجه أحمد وابو يعلى والطبراني وصححه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب (٢٩٨).

لەخاو و خێزانەکەی، کەسێ لە ماڵ دەرچێ بەرەو مزگەوت بۆ نوێژی جەماعەت، کەسێکیش لە ماڵ دەرچێ بۆ جیهاد و تێکۆشان لە ڕێی خوا.

* سوننەتە ئەم دوعایە بخوێنرێت لە کاتی چوون بۆ مزگەوت: (اللهم اجعل في قلبي نوراً، وفي لساني نوراً، اجعل لي في سمعي نوراً، واجعل في بصري نوراً، واجعل من خلفي نوراً ومن أمامي نوراً، واجعل من فوقي نوراً ومن تحتي نوراً، اللهم اجعلني نوراً)[1]. واتە: پەروەردگارا نوور و ڕووناکی بخەرە دڵمەوە، هەروەها نوور بخەرە سەر زوبانم، نوور بخەرە بیستنم، نوور بخەرە چاومەوە، لە پشتمەوە نوور بێ، لە سەرمەوە نوور بێ، لە ژێرمەوە نوور بێ، خودایە نوورروم پێ ببەخشە.

## فەزڵی تایبەتی هەندێ مزگەوت

یەکەم: نوێژکردن لە مزگەوتی (الحرام)و مزگەوتی پێغەمبەردا: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (صَلاَةٌ فِي مَسْجِدِي هَذَا خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ صَلاَةٍ فِيمَا سِوَاهُ إِلاَّ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ)[2]. واتە: خێری یەك نوێژ لەم مزگەوتەی مندا خێری هەزار نوێژی مزگەوتەکانی تری هەیە، جگە لە مزگەوتی (الحرام).

* عەبدوڵای کوڕی زوبێر (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (الصلاة في المسجد الحرام افضل من مائة صلاة في هذا)[3]. واتە: نوێژێکی مزگەوتی (الحرام) خێری سەد نوێژی ئەم مزگەوتەی منی هەیە.

دووەم: مزگەوتی ئەقصا (مَسْجِدِ الأَقْصَى): ئەبو هورەیرە ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (لاَ تُشَدُّ الرِّحَالُ إِلاَّ إِلَى ثَلاَثَةِ مَسَاجِدَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ، وَمَسْجِدِ الرَّسُولِ وَمَسْجِدِ الأَقْصَى)[4]. واتە: بنەو بارگە مەپێچنەوە تەنها بۆ ئەم سێ مزگەوتە نەبێ، مزگەوتی (الحرام) و ئەم مزگەوتەی من و مزگەوتی ئەقصا.

---

(١) رواه مسلم: (٦/٥١).

(٢) صحيح البخاري: (١١٩٠)، ومسلم: (١٣٩٥).

(٣) أخرجه أحمد وابن خزيمه وصححه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب: (١١٧٢).

(٤) أخرجه البخاري: (١١٨٩) ومسلم: (١٣٩٧).

سێیەم: مزگەوتی قوباء: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (من تَطهر في بيتهِ، ثمّ أتى مسجد قُباء، فصلى كانَ لَهُ كأجرِ عَمْرةٍ)[1]. واتە: هەرکەسێك لە ماڵەوە خۆی پاك بکاتەوە و دەستنوێژ بگرێت و بێت بۆ مزگەوتی قوباء، نوێژی تێدا بکات، ئەوە خێر و پاداشتی عەمرەیەکی تەواوی هەیە.

*لە (الصحيحين)دا هاتووە ئەبو زەری غیفاری فەرمووی: (سألت النبي اي مسجد وضع في الارض أول؟ قَالَ: (المَسجد الحرام، ثُمَّ المَسجدَ الأقصى، ثمّ حيثما أدركتك الصلاة فصل فإنَّهُ مسجد)[2]. واتە: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ کام مزگەوت یەکەم جار لەسەر زەویدا دروستکراوە؟ فەرمووی: مزگەوتی (الحرام) پاشان مزگەوتی ئەقصا، لەهەرکوێدا کاتی نوێژ هات نوێژەکەت بکە ئەو شوێنە مزگەوتە.

## فەزڵی پەیوەست بوون بە مزگەوتەوە :

مزگەوت نیعمەتێکی گەورەیە، سەرچاوەی خێر و خۆشییە بۆ موسوڵمانان چاکترین شوێنی سەر زەوییە، شوێنی یەکتر ناسین و خۆشەویستی و برایەتییە، بۆیە پێویستە موسڵمان دڵی پێوە ببەستێتەوە بە هەمیشەیی، واش ناڵێین بە تەمەڵی و تەوەزەلی لە مزگەوتدا بمێنێتەوە بە بێ کار..

عومەری کوڕی خەتتاب (رەزای خوای لێ بێ) بینی کۆمەڵێك لە مزگەوتدا دانیشتوون لە دوای نوێژ بەبێ ئیش و کار بەقسەی خۆیان پشتیان بەخوا بەستووە، ئەویش لەوێدا وتە بەناو بانگەکەی فەرموو: "با هیچ کەس لە ئێوە لە دوای نوێژ کردن دانەنیشێ لە مزگەوتدا داوای رزق و رۆزی بکات و بڵێ: خوایە رزق رۆزیم پێ ببەخشە لە کاتێکدا دەشزانێ کە لە ئاسمانەوە ئاڵتون و زیو ناباریٚ".

(١) أخرجه أحمد والنسائي و صححه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب: ١٦٨١.

(٢) ابن قيم في كتاب الصلاة، ص ٨٠.

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوۡمِ ٱلۡجُمُعَةِ فَٱسۡعَوۡاْ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَذَرُواْ ٱلۡبَيۡعَۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ۝٩ فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَٱبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرٗا لَّعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ﴾ الجمعة: ٩ - ١٠. واتە: ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوە کاتێك بانگدرا بۆ نوێژی جومعە، ئێوە بە پەلە بچن بەدەم یادی خواوە و واز لە کڕین و فرۆشتن بهێنن، چونکە ئا ئەوە چاکتر و باشترە بۆ ئێوە ئەگەر بزانن و تێبگەن، کاتێك نوێژ تەواو بوو، بڵاوببنەوە بەرووی زەویدا، داوای رزق و رۆزی و بەهرەی خوا بکەن و هەوڵی رۆزیی بدەن و، زیکر و یادی خوا زۆر بکەن بۆ ئەوەی سەرفەرازو سەرکەوتوو بن.

* پێغەمبەری خواش ﷺ دەفەرموێت: (اليَدُ العُليا خيرٌ مِن يَدِ السُفلى..)[1]. واتە: ئەو دەستەی کاری پێ دەکرێت چاکتر و باشترە لەوەی کاری پێناکرێت و دەست پان دەکاتەوە.

* ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللَّهُ فِي ظِلِّه يَوْمَ لاَ ظِلَّ إِلاَّ ظِلُّهُ الإِمَامُ الْعَادِلُ، وَشَابٌّ نَشَأَ فِي عِبَادَةِ رَبِّه، وَرَجُلٌ قَلْبُهُ مُعَلَّقٌ فِي الْمَسَاجِد، وَرَجُلاَنِ تَحَابَّا فِي اللَّه اجْتَمَعَا عَلَيْه وَتَفَرَّقَا عَلَيْه، وَرَجُلٌ طَلَبَتْهُ امْرَأَةٌ ذَاتُ مَنْصِب وَجَمَالٍ فَقَالَ إِنِّي أَخَافُ اللَّهَ. وَرَجُلٌ تَصَدَّقَ أَخْفَى حَتَّى لاَ تَعْلَمَ شِمَالُهُ مَا تُنْفِقُ يَمِينُهُ، وَرَجُلٌ ذَكَرَ اللَّهَ خَالِيًا فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ)[2]. واتە: حەوت کۆمەڵ لەژێر سێبەری خوای گەورەدان، کە لەو ڕۆژەدا هیچ سێبەرێکی تر نییە جگە لەسێبەری ئەو:

١- کاربەدەستی دادپەروەر.

٢- لاوێ لە بەندایەتی کردندا بۆ خوا پێ گەیشتوویێ و بەردەوام بێ لە سەری.

٣- پیاوێ دڵی بەمزگەوتەوە پەیوەست و ئالوودە بێ.

---

(١) صحيح، صحيح سنن أبوداود: (١٣٢/٢).

(٢) صحيح البخاري: (٦٦٠) (١٤٢٢)، تحفة ١٢٢٦٤.

٤- دوو پیاو لەبەر خوا یەکترییان خۆشبوێت، کۆببنەوەو جیاببنەوە لەبەر ڕەزامەندی خوا، تەنها مردن لێکیان جیا بکاتەوە، نەك پارە و پلە و پایەی دنیایی و شتی تر.

٥- پیاوێ کە ئافرەتێکی خان و مانی شۆخ و شەنگ داوای کاری خراپی لێ بکات، بەڵام ئەو بڵێ من لە خوا دەترسم و ئەو کارە ناکەم.

٦- پیاوێ خێر بکات بە پەنامەکی و بەدەستی ڕاست بیکات دەستی چەپی نەزانێت، واتە ئەوەندە نهێنی بێت کەس پێی نەزانێت، نەوەك لای خەڵك باسی بکات و منەت بکات بەسەر ئەو کەسەدا کە پێی دەبەخشێ.

٧- پیاوێك لە شوێنێکی چۆڵدا زیکر و یادی خوا بکات و فرمێسك بڕێژێ.

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (المَسجِدُ بَيتُ كُلِّ تَقِيٍّ)[1]. واتە: مزگەوت ماڵی هەموو خاوەن تەقوایەکە، خانەولانەی لە خواترسانە.

* ئەبوهوریرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (ماتَوطَّن رجُلٌ المساجدَ للصَّلاة و الذِّكر إلا تَبَشبشَ اللهُ - تعالى- اليه، كَما تَبَشبش أهل الغَائب بغائبهم إذا قدم عليهم)[2]. واتە: جێگە گرتنی پیاوێك لە مزگەوتدا بۆ نوێژکردن و یادی خوا، خوای گەورە پێی خۆشە و ڕێزی لێدەگرێ، وەك کەس و کاری ئەو کەسە خۆشەویستەی کە دیار نامێنێ و پاش ماوەیەکی زۆر لەگەڵ کەس و کارەکەی بەیەکتر شاد دەبنەوە.

* پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (إنّ للمَسَاجِدِ أوتاداً، الملائكة جلساؤهم، إنْ غَابُوا يَفتَقدُهُم، وان مَرِضُوا عَادُهُم، وَإن كانوا في حَاجَةٍ أعانوهم)[3]. واتە: لە هەموو مزگەوتەکاندا پایە هەیە ڕاگیریان دەکات، ملائیکەکان کۆڕی تیادەگرن، ئەوانەی ئەهلی مزگەوتن دیار نەبوون هەواڵیان دەپرسن، ئەگەر نەخۆش بوون سەردانیان دەکەن، ئەگەر پێویستیان بەیارمەتی هەبوو یارمەتیان دەدەن.

---

(١) أخرجه الطبراني والبزار وحسنه لغيره الألباني في صحيح الترغيب والترهيب: (٣٣٠).

(٢) أخرجه إبن ماجة وابن خزيمة والألباني في صحيح الترغيب والترهيب: (٣٢٧).

(٣) أخرجه أحمد وقال الألباني حسن صحيح في صحيح الترغيب و الترهيب: (٣٢٩).

چاکترین شوێن لەسەر زەویدا مزگەوتە، جا بۆیە موسڵمانان تا بۆیان دەکرێ هاتوچۆی مزگەوت بکەن و تیایدا بمێننەوە بەبێ دەنگی و، ڕێزی مزگەوت بگرن و خۆیان و مزگەوتەکەیش بەپاك و خاوێنی ڕابگرن.

* ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (الْمَلاَئِكَةُ تُصَلِّي عَلَى أَحَدِكُمْ مَا دَامَ فِي مُصَلاَّهُ مَا لَمْ يُحْدِثْ اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ، اللَّهُمَّ ارْحَمْهُ. لاَ يَزَالُ أَحَدُكُمْ فِي صَلاَةٍ مَا دَامَتِ الصَّلاَةُ تَحْبِسُهُ، لاَ يَمْنَعُهُ أَنْ يَنْقَلِبَ إِلَى أَهْلِهِ إِلاَّ الصَّلاَةُ)[1]. بەردەوام مەلائیکە سلاوات لەسەر کەسێك دەدەن هەتا لە شوێنی نوێژەکەی بمێنێتەوە و دەستنوێژی هەبێت، دەڵێن خودایە لێی خۆشبە، خودایە ڕەحمی پێ بکە، بەردەوام بە نوێژ بۆی حسابە مادەم چاوەڕوانی نوێژ دەکات. تەنها نوێژ ڕێگری ئەوەی لێکردووە کە ناگەڕێتەوە بۆ ناو کەس و کاری.

پێشەوا عەلی کوڕی ئەبوتالب (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمویەتی: ئیماندار کاتێك ڕۆحی دەردەچێت جێگا نوێژەکەی و ئەو مەلائیکانەی کردەوە چاکەکانی سەردەخەن بۆ ئاسمان بۆی دەگرین)[2].

# تێگەیشتن لە نوێژ

بێگومان دەبێ ئەوە بزانین کە نوێژ گەورەترین عیبادەت و خوا پەرستییە، ئێمەش تەنها بۆ عیبادەت بەدی هێنراوین، بۆیە پێویستە نوێژەکانمان بە تێگەیشتنەوە بکەین، خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:﴿ وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴾ الذاريات: ٥٦.

پێویستە بە خۆشەویستییەوە لە نوێژەکانمان بڕوانین بە ڕوحیەتێکی باش و شەوق و زەوقەوە ئەنجامی بدەین، نەك هەروەك ئاهەنگ و بۆنەکان چۆن بەڕێ دەکەین ئاواش نوێژەکان بەڕێ بکەین و تەواو.

---

(١) صحيح البخاري: (٦٥٩).

(٢) إحياء علوم الدين: ١/٣٥١.

گەڕان و هەوڵدان بە دوای زانستی شەرعیدا هۆکارن بۆ بەختەوەری مرۆڤ لە ژیانی دونیا و دوا ڕۆژدا، ئەو کەسانەی کە شەرع ناس و شارەزا و زانان زیاتر لە خوای گەورە دەترسن و پلە و پایەیان لە کەسانی تر و لە ئیمانداران بڵندترە لە لای خوا.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُا۟﴾ فاطر: ٢٨. واتە: تەنها بەندە شەرع زانەکان لە خوا دەترسن.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾ الزمر: ٩. واتە: بڵێ ئایا ئەو کەسانەی کە شارەزان و شەرع زانن وەك ئەو کەسانەن کە نەشارەزان؟.

لە بارەی پلەی بەرز و فەزڵی زاناوە دەفەرموێت: ﴿يَرْفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ دَرَجَٰتٍ﴾ المجادلة: ١١. واتە: خوا پلەی ئیمانداران لە ئێوە و ئەوانەی زانستی شەرعیان پێدراوە بەرز دەکاتەوە.

ئەمانەی لای خوارەوە چەند فەرموودەیەکن لەو بارەوە:

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (مَنْ يُرِدِ اللّٰهُ خيراً يُفَقِّهْهُ في الدِّين)[1]. واتە: ئەگەر کەسێك خوای گەورە خێر و چاکەی بۆبوێت ئەوا شارەزا و زانای دەکات لە ئایینی ئیسلام.

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (من سلك طريقاً يلتمس فيه علماً سهّل الله له طريقاً إلى الجنة وإنّ الملائكة لتضع أجنحتها رضاً لطالب العلم وانّ العالم يستغفر له من في السموات ومن في الارض حتى الحيتان في الماء وإنّ فضل العالم على العابد كفضل القمر على سائر الكواكب وإنّ العلماء ورثة الانبياء وإنّ الانبياء لم يورثوا ديناراً ولا درهماً وإنّما ورّثوا العلم فمن أخذه أخذ بحظ وافر)[2]. واتە: هەر کەسێك ڕێگایەك بگرێتە بەر بۆ بەدەست خستنی زانستی شەرعی ئەوا خوای گەورە ڕێگای بەهەشتی بۆ ئاسان دەکات، وە فریشتەکان باڵیان ڕادەخەن بۆ ئەو کەسەی دەگەڕێت بە دوای زانستی شەرعیدا لەبەر ئەوەی ڕازین بەوەی بۆی دەگەڕێن، وە هەموو ئەوانەی کە لە ئاسمانەکان و زەویدان داوای لێ

---

(١) البخاري: (٧١)، ومسلم في الزكاة: (٩٨).

(٢) صحيح سنن أبـي داود رقم: (٣٦٤١)، وصحيح سنن ابن ماجه رقم: (١٨٢).

خۆشبوون دەکەن بۆ شەرع زانەکان تەنانەت ماسیش لە دەریادا، وە گەورەیی و چاکێتی شەرع زان بە سەر بەندەی خوا پەرستدا وەك چاکێتی و جوانی مانگ وایە بە سەر هەموو ئەستێرەکانەوە، زانایان میراتگری پێغەمبەرانن، پێغەمبەرانن دینار و درهەمیان بە میرات بەجێ نەهێشتووە بەڵکو تەنها زانستی شەرعیان بە میرات بەجێ هێشتووە، جا هەرکەسێك بەدەستیخات ئەوە بەشێکی زۆری بەدەست ختسووە.

* صەفوانی کوڕی عەسال هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من هاتووم بۆ بەدەست خستنی زانستی شەرعی؟. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خۆشحاڵێن بە هاتنی فێرخوازی زانستی شەرعی، فێرخوازی زانستی شەرعی فریشتەکان دەوری دەدەن و بە باڵیان سێبەری بۆ دەکەن جا هەندێکیان بەسەر هەندێکیاندا دەچن بەیەکدا تا دەگەنە ئاسمانی دونیا لە خۆشەویستی ئەوەی بەدوایدا دەگەڕێت![1]

تێگەیشتن و فیقهی نوێژ دەرك کردنە بە نهێنیەکانی نوێژ و فەرمانبەرداری و ناوکرۆك و رۆحەکەی، بەڵام زانستی نوێژ دەرك کردنە بە زانینی مەرجەکانی نوێژ و روکنەکانی واجب و موستەحەبەکانی.

* ئەبو هوریرە (رەزای خوای لێ بێ) گێڕایەوە پیاوێ رۆشتە ژوورەوە بۆ مزگەوت و نوێژی کردو هات سلاوی کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ. پێغەمبەری خوا وەڵامی سلاوەکەی دایەوە و فەرمووی: بڕۆ نوێژەکەت بکەرەوە چونکە تۆ نوێژت نەکرد، تاسێ جار پیاوەکە نوێژەکەی کردەوە، پاشان سوێندی خوارد و وتی بەو کەسەی تۆی بەحەق ناردووە لەوە چاکتر نازانم نوێژ بکەم فێرم بکە، فەرمووی: (کاتێك هەستای بۆ نوێژ کردن دەستنوێژێکی چاکی لێ بگرە، پاشان روو بکەرە قیبلە و نوێژ دابەستە (اللّٰه أکبر) بکە، پاشان ئەو قورئانە کەمەی کە لەبەرتە و دەیزانی بیخوێنە، پاشان رکوع بەرە تا دڵنیا دەبیت لە رکوعدای لەشت لە جووڵە دەکەوێ، پاشان راست بەرەوە راوەستە، پاشان سەجدە بەرە و ئەوەندە بمێنەرەوە تا بزانی لە سەجدەدای، دوایی هەستە بۆ بەینی دوو سەجدەکە هەر بەوجۆرە تا

---

(١) صحيح سنن الترمذي: (٣٥٣٥)، صحيح سنن ابن ماجه: (٢٢٦)، وأحمد: (٢٣٩/٤).

لەشت لە جووڵە دەکەوێ، پاشانیش بچۆرەوە سەجدە بە شێوەی پێشوو، لە هەموو نوێژەکەتدا بەو شێوەیە بکە)[1].

کەواتە هێمنی و ئارامی لە نوێژدا هەموو هەستان و دانیشتن و رکوع و سەجدەکان دەگرێتەوە و بەشێکە لە فیقهی نوێژ و رۆحەکەی.

پێویستە لەسەرمان بگەڕێینەوە بۆ سەردەمی ئاسانکاری، سەردەمی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی، ئەو سەردەمەی کە قورسی لە نوێژ و عیبادەتەکانی تردا نەبوو، خوای گەورە لەسەر شانی موسوڵمانان سوك و ئاسانی کرد، کە ئەوەش رەحمەتێکی گەورەی خوایی بوو بۆ ئەم ئوممەتە ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلۡيُسۡرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلۡعُسۡرَ﴾البقرة: ١٨٥ . واتە خوای گەورە کار ئاسانی دەوێت بۆ ئێوە،کار گرانی ناوێت بۆتان.

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (يَسِّرُوا وَلاَ تُعَسِّرُوا وَبَشِّرُوا وَلاَ تُنَفِّرُوا)[2]. واتە: ئاسانکاری بکەن کارگران مەکەن، مژدەی خۆش بدەن بە خەڵکی، بە هەڕەشە و گوڕەشە و کارگرانی خەڵك لە ئایین دوور مەخەنەوە.

* ئیبن مەسعود (رەزای خوای لێ بێ) فەرموی: پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من لەبەر فلان کەس لە نوێژی بەیانی دوا دەکەوم ئەوەندەی درێژەی پێدەدات! ئیبن مەسعود فەرمووی: هەرگیز لە ئامۆژگاری کردندا وەك ئەو رۆژە پێغەمبەرم ئاوا بە توڕەیی نەدیوە، فەرمووی ﷺ: (ئەی خەڵکینە! هەندێ لە ئێوە خەڵك لە نوێژکردن دوور دەخاتەوە، بەخوێندنی ئایەتی زۆر خەڵك لە نوێژی جەماعەت و مزگەوت دوور دەخاتەوە، جا هەرکەسێکتان پێش نوێژی بۆ خەڵك کرد با نوێژێکی کورت و پوختیان بۆ بکات، چونکە ئەوانە هەیانە پیرە هەیانە لاوازە یان نەخۆشە، هەشیانە ئیش و کاری تری هەیەو پەلەیەتی)[3].

* عایشە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ سەرپشك بکرایە لە نێوان دووکاردا، هەرکارێکیان ئاسان بوایە ئەوەیانی هەڵدەبژارد، بەمەرجێ ئەو

---

(١) صحيح البخاري: (٧٥٧).

(٢) البخاري: (٦٩)، ومسلم: (١٧٣٤).

(٣) أخرجه البخاري: (٧٠٢)، ومسلم: (٤٦٦).

کاره گوناه نەبوایە، ئەگەر گوناه بوایە لە هەموو کەس زیاتر خۆی بەدوور دەگرت لێی، هەرگیز تۆڵەی لە کەس نەدەسەند لەسەر حەقی خۆی و کابرای دەبەخشی، مەگەر کەسێك ڕێزی شەریعەتی خوای بشکاندایە، ئەوا بۆ خوا تۆڵەی لێ دەسەند)[1].

* هەروەها عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆلام ئافرەتێکم لە لابوو، فەرمووی: ئەوە کێیە؟ گوتم: ئەمە فلانە ئافرەتە کە ئەوەند نوێژخوێن و خوا پەرستە، فەرمووی: بێ دەنگ بە ئەی عائیشە! ئەوەندە عیبادەت بکەن بۆ خوا لە تواناتاندا بێت، چونکە هەتا ئێوە وەڕس نەبن لە خوا پەرستی خوای گەورە وەڕس نابێ لە پاداشت دانەوەتان، باشترین ئایینداری ئەوەیە خاوەنەکەی بەردەوام بێ لەسەری[2].

* ئیبن مەسعود (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ سێ جار لەسەر یەك فەرمووی: (هَلَكَ الْمُتَنَطِعُونَ، قالَها ثَلاثًا)[3].واتە: ئەوانەی شت قوڵ دەکەنەوە و زێدەڕەوی دەکەن بە هیلاکدا دەچن.

* تەلحەی کوڕی عبیداللە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێکی خەڵکی نەجد قژ بژی دەنگ گەورە لە دوورەوە دەنگی دەهات کەس لێی حاڵی نەدەبوو هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری دەربارەی ئیسلام کرد؟. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: پێنج فەرز نوێژە لە شەو و ڕۆژێکدا. وتی: جگە لەوە هیچی ترم لەسەر فەرزە؟. فەرمووی: نەخێر مەگەر خۆت نوێژی سوننەت بکەیت). پاشان فەرمووی: مانگی رەمەزان بە ڕۆژوو بە. وتی جگە لە مانگی رەمەزان ڕۆژووی ترم لەسەر فەرزە؟. فەرمووی: نەخێر مەگەر خۆت ڕۆژووی سوننەت بگریت. باسی زەکاتیشی بۆ کرد، وتی جگە لەوە زەکاتی ترم لەسەر فەرزە؟ فەرمووی: نەخێر مەگەر خۆت خێری زیادە بکەیت لەو سامانە خوا پێی بەخشیوی. پیاوەکە پشتی هەڵکردوو ڕۆشت لەبەر خۆیەوە دەیوت سوێند بە خوا نە لەوە زیاتر دەکەم نە لەوەش کەمتر. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر ڕاست بکات سەرفراز و سەرکەوتووە[4].

---

(١) أخرجه البخاري: (٣٥٦٠)، ومسلم: (٢٣٢٧).

(٢) أخرجه البخاري: (١١٥١)، ومسلم: (٧٨٥).

(٣) أخرجه مسلم: (٢٦٧٠).

(٤) صحيح ، أبو داود: (٣٩١).

* ئیبن مەسعود (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: "ئەوەی شوێن سوننەت و ئاکار و ڕەوشتی جوان دەکەوێت با شوێنی ئەوە بکەوێ کە مردووە، چونکە زیندو پارێزراو نییە لە بەڵاو فیتنەی دنیا، ئەوانەش هاوەڵانی پێغەمبەرن ﷺ کە باشترین کەس بوون لەم ئوممەتەدا، خاوەنی دڵ و دەرونێکی پاك و چاك بوون، زانیاریەکی قوڵیان هەبوو، تەکلیفیان کەم بوو خوای گەورە هەڵی بژاردبوون بۆ هاوڕێیەتی پێغەمبەرەکەی، بۆ گەیاندنی ئایینەکەی، بۆ ئەوەی فەزڵیان بزانن، شوێن پێیان هەڵگرن و لەسەر ڕێگە و ڕێبازیان بڕۆن، چونکە ئەوانە لەسەر ڕێگای هیدایەتی ڕاستەقینە بوون"[1].

# فەزڵی چاوەڕوانی نوێژ

چاوەڕوانی نوێژ لە دوای نوێژ خێرێکی گەورەی هەیە، بە نوێژ کردن حساب دەکرێ ئەو چاوەڕوانییە، مەلائیکەکان بۆ ئەو کەسە دەپاڕێنەوە مادەم دەستنوێژی هەیە و قسەی دنیایی و بێهوودە ناکات و ئازاری کەس نادات، هەروەها دەبێتە هۆی کەفارەتی تاوان بە بەڵگەی ئەم فەرموودانەی لای خوارەوە:

* ئەبوهوریرە (رەزای خوای لێ بێ) فەرموی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (المَلائكةُ تُصَلِّي على أَحَدِكُم مَادام فِي مصَلاَّهُ مَالَم يُحدث: أَللهُمَّ اغفر لَهُ، أَللهُمَّ ارحمهُ. لايَزالُ أَحَدُكم فِي الصلاة ما دَامَ الصلاة تَحبِسُه، لايمنَعُه يَنقَلِبَ إلى أَهلِه إلاّ الصَّلاَةُ)[2].

واتە: بەردەوام مەلائیکە داوای لێ خۆشبوون دەکەن بۆ کەسێك کە چاوەڕوانی نوێژ دەکات تا دەست نوێژی هەبێ دەڵێن: خودایە لێی خۆشببە، خودایە ڕەحمی پێبکە، بەردەوام کەسێك لە ئێوە کە نوێژ گیری دابێ و مابێتەوە لە مزگەوتدا یان لە جێگە نوێژەکەیدا بە نوێژ بۆی حسابە، مادەم تەنها نوێژ ڕێگری لێکردووە بگەڕێتەوە بۆ ناو ماڵ و منداڵی.

* ئەنەس (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی عیشای دواخست بۆ نیوەشەو نوێژەکەی تەواو کرد و ئاوڕی دایەوە بەلاماندا و فەرمووی: خەڵك

---

(١) ابن قيم الجوزية في الكتاب الصلاة.

(٢) أخرجه البخاري: (٦٥٩).

نوێژیان کرد لە ماڵەکانیاندا یان لە مزگەوتی هۆزەکانیاندا و راکشان و لێی خەوتن، ئێوەش لەو کاتەوە چاوەڕوانی نوێژ دەکەن بە نوێژ بۆتان حسابە پاداشتی لەسەر وەردەگرن[1]

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: شتێکتان فێردەکەم ئەگەر کردتان گوناهتان هەڵدەوەرێنێ و پلەتان بەرزدەکاتەوە؟ وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! فەرمووی: دەستنوێژ گرتن لە کاتی ناخۆشیدا، زۆر هەنگاو نان بەرەو مزگەوتەکان، چاوەڕوانی نوێژ لە دوای نوێژ، ئا ئەوەیە سەنگەرگرتن بۆ خەبات و تێکۆشان، ئا ئەوەیە سەنگەرگرتن، ئا ئەوەیە سەنگەرگرتن[2]

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (القاعدُ عَلَى الصَّلاة كالقَانت، ويُكتَب مِن المُصلين مِن حين يَخرج مِن بيته حتى يَرجع إليه)[3] واتە: ئەو کەسەی دانیشتووە و چاوەڕوانی نوێژ دەکا پاداشتەکەی وەك هی ئەو کەسەیە بەپێوە نوێژ دەکات، مادەم چاوەڕوانی نوێژ دەکات، ناوی لە ریزی نوێژخوێنان تۆمار دەکرێ، لەو کاتەوە لە ماڵ دەردەچێ تا دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە.

عەلی کوڕی ئەبو تالب (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (اسباغ الوضُوء في المكاره و إعمال الاقدام الى المَساجد، وَ إنَتظار الصَلاَة بَعدَ الصَلاة، يَغسِلُ الخطايا غُسلاً)[4]. واتە: دەست نوێژ گرتن لەکاتی ناخۆشیدا، هەنگاونان بەرەو مزگەوتەکان چاوەڕوانی نوێژ لە دوای نوێژ، پاك پاك گوناه دەشۆنەوە.

* عەبدوڵای کوڕی عەمر (رەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ نوێژی شێوانمان کرد، ئەوەی رۆشتەوە بۆ ماڵەوە رۆشتەوە، ئەوەی مایەوە لە مزگەوت مایەوە بۆ نوێژی عیشا، پێغەمبەری خوا ﷺ بە هەڵەداوان و هەناسەبڕکێ تا ئەژنۆی خۆی هەڵکردبوو هات فەرمووی: مژدە بدەن، ئەوا خوای گەورە دەرگایەك لە دەرگاکانی

---

(١) أخرجه البخاري: (٦٦١).

(٢) أخرجه مسلم: (٢٥١) (٦١٠).

(٣) أخرجه ابن حان و صححه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب: (٤٥٤).

(٤) أخرجه أبو يعلى والحاكم وصححه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب: (٤٤٩).

بەهەشتی کردەوە بۆتان و مەلائیکەکان خۆزگەتان پێ دەخوازن. خوای گەورە فەرمووی: سەیری بەندەکانم بکەن، نوێژێکی فەرزیان ئەنجام داوە و، چاوەڕوانی نوێژێکی تر دەکەن[1].

# تەرکی نوێژی جەماعەت

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱرْكَعُوا۟ مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ ﴾ البقرة: ٤٣. واتە: نوێژ بکەن و زەکات بدەن لەگەڵ رکوع بەراندا رکوع بەرن.

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ئەو کەسانەی نوێژی جەماعەتی جومعە ناکەن، یان دەبێ دەست لەوکارە ناپەسەندە هەڵگرن، یان ئەوەتا خوای گەورە مۆر دەنێ بەسەر دڵیاندا، بەرەبەرە بێ ئاگادە بن و دەچنە ریزی ئەو کەسانەی لە خوا غافڵ و بێ ئاگان.[2].

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (انَّ أَثْقَلَ الصَلاَةَ عَلى المُنافقِينَ صَلاةُ العشاءِ وصَلاةُ الفَجْرِ ولَوَ يَعْلَمُونَ مَافِيهما لأَ تُوْهُما ولَو حَبْواً)[3]. واتە: قورسترین نوێژ لەسەر مونافیقەکان نوێژی بەیانی و عیشایە، ئەگەر بتان زانیایە خێر و پاداشتیان چەندە زۆرە بە جەماعەت لە مزگەوتدا، بە سنگەخشێ بۆی دەڕۆشتن.

* ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خوای لێ بێ) وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (مَن صلّى لله أرْبَعين يَوماً فى جَماعة، يُدرِكُ التَكبِيرةَ الأولى، كُتبَ لَهُ بَراءتان بَراءَة منَ النّار، وَبَراءة مِنَ النِّفاق)[4]. واتە: هەرکەسێك چل رۆژ لەبەر رەزامەندی خوای گەورە بگات بە (الله اکبر)ی یەکەمی نوێژدابەستندا بە جەماعەت لە مزگەوتدا، بۆی دەنوسرێ ئەو کەسە لە دووشت رزگاری دەبێ لە ئاگر و لە نیفاق.

ئەمەش هاندانی موسڵمانانە بۆ ئەوەی سوربن لەسەر ئامادە بوون بۆ نوێژی جەماعەت و دووربن لە نیشانەی مونافیقی و مونافیقەکان.

(١) أخرجه إبن ماجة، وصححه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب: (٤٤٥).

(٢) أخرجه البخاري الجمعه (٨٧٧)، ومسلم في الجمعه: (١).

(٣) رواه مسلم: (١٤٨٠)، صحيح مسلم بشرح النووى.

(٤) حسنه لغيره الألباني في صحيح الترغيب والترهيب: (٤٠٩)، والصحيحة: (١٩٧٩).

* پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نیازم کرد فەرمان بدەم یەکێك پێش نوێژیتان بۆ بکات و خۆشم لەگەڵ چەند پیاوێکدا کە کۆڵە داریان پێ بێ بڕۆم ماڵی ئەوکەسانە بسوتێنم بەسەریاندا بەشداری نوێژی جەماعەت ناکەن[1]

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: بەردەوام بن و کۆڵ مەدەن، بزانن کە چاکترین کردەوەی ئێوە نوێژە، بزانن جگە لە ئیماندار کەس پارێزگاری لە دەستنوێژ ناکات.

عەبدوڵای کوڕی مەسعود (رەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: ئەگەر ئێوەش لە ماڵەوە نوێژ بکەن و تەرکی جەماعەت بکەن، وەك ئەو پیاوەی لە ماڵەوە نوێژەکەی دەکات و ئامادەی جەماعەت نابێ، ئەوە تەرکی سوننەتی پێغەمبەرتان ﷺ کردووە ئەگەر واشتان کرد ئەوا گومڕا و سەر لێ شێواو دەبن.

هەروەها دەفەرموێت: (ئێمە وامان بینیوە کە تەنها ئەو مونافیقانەی کە ناسراو بوون دوا دەکەوتن لە نوێژی جەماعەت، چونکە نوێژی جەماعەت لە سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەرە ﷺ کە لەسەری بووە..)[2].

سەعیدی کوڕی جوبەیر (رەزای خوای لێ بێ) وتی: عەبدوڵای کوڕی عەباس (رەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: (هەرکەسێك گوێی لە بانگ بێ و نەچێ بەدەمیەوە و نوێژەکەی بە جەماعەت نەکات بەبێ بەهانە ئەوە نوێژی بۆ نییە)[3]

پێشەوا موجاهید (بەرەحمەت بێ) فەرمووی: پاوێك پرسیاری کرد لە ئیبن عەبباس (رەزای خوایان لێ بێ)، وتی: پیاوێك بە ڕۆژ بە ڕۆژوو بێ و شەوانە شەونوێژ بکات بەڵام ئامادەی جومعە و جەماعەت نەبێ ئەوە حوکمی چۆنە؟ فەرمووی: ئەوە لە ئاگردایە[4]!!. واتە: ئەگەر بەردەوام بێ لەسەر ئەوکارەی دەچێتە ئاگری دۆزەخەوە.

---

(١) أخرجه البخاري: (٦٤٤)، ومسلم: (٦٥٥).

(٢) رواه مسلم: (٦٥٤).

(٣) كتاب الصلاة لإبن قيم الجوزية ص(٧٤).

(٤) كتاب الصلاة لإبن قيم الجوزية ص(٧٤).

عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێ) باخێکی هەبوو چوو سەردانی کرد تا گەڕایەوە نوێژی عەسری بە جەماعەت فەوتا باخەکەی کرد بە خێر لەرێی خوا[1].

# خوای گەورە بۆچی سامانی پێ بەخشیوین؟

خوای گەورە سامانی پێ بەخشیووین بۆ ئەوەی نوێژ بکەین و زەکات بدەین، بەو سامانە جەستەمان بپارێزین لە نەخۆشی بۆ ئەوەی چوست و چلاك بین و بە شەوق و زەوقەوە پەرستشەکان ئەنجام بدەین.

* خوای گەورە لە فەرمودەی قودسیدا دەفەرموێت: (إنا أنزلنا المال لإقام الصلاة وايتاء الزكاة، ولو كان لابن آدم واد لأحب أن يكون إليه ثان ولو كان له واديان لأحب أن يكون إليهما ثالث، ولا يملأ جوف ابن آدم إلا التراب، ثم يتوب الله على من تاب)[2].

واتە: من ماڵ و سامانم بۆ ئەوە پێ بەخشیوون بۆ ئەوەی نوێژەکانتان ئەنجام بدەن و زەکاتی ماڵەکەشتان بدەن، ئەگەر نەوەی ئادەم شیوێك ماڵ و سامانی هەبێ، حەزدەکات بیکات بە دوان، ئەگەر دوو شیویشی هەبوو، حەز دەکات بیکات بەسیان، نەوەی ئادەم تێر نابێ مەگەر ئەو گڵە تێری بکات کە دەیکەن بەسەریدا لە گۆڕەکەیدا، خوای گەورەش لەو کەسە خۆش دەبێ، کە تەوبە دەکات و دەگەڕێتەوە بۆلای.

خوای گەورە ئەم مرۆڤەی بۆ پەرستش و عیبادەتی خۆی بەدیهێناوە:﴿ وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴾ الذاريات: ٥٦.

دەی نوێژیش گەورەترین پەرستشە، شتەکانی تریشی کردووە بە وەسیلە بۆ ئەوەی بەکاری بهێنن بۆ فەرمانبەرداری خوای پەروەردگار، وەك خواردن و خواردنەوە، ئاژەڵەکان، ماڵ و سامان، ژن و ژن خوازی و چەندەها شتی تر..مرۆڤ بەماڵ و سامان ژن دەهێنێ و ئیمانی خۆی پێ تەواو دەکات، چونکە ژن هێنان نیوەی ئیمانە.

---

(١) مختصر منهاج القاصدين: ابن القدامه.

(٢) أخرجه احمد و الطبراني في الكبير و صححه الألباني في الصحيحة: ١٦٣٩.

* پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ دەفەرموێت: (إذا تَزَوَجَ العَبدُ فَقَد استَكمَلَ نِصفُ الدِّين، فَليَتقِ اللهَ فِيمَا بَقِي)[1]. واتە: كاتێك بەندەیەك ژنی هێنا، ئەوە نیوەی ئایینەكەی تەواوكردووە، با لە خوا بترسێ بۆ نیوەكەی تری.

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (یا معشَر الشَباب من استطاع منكم الباءة فليتزوج، فإنه أغض للبصر وأحصن للفرج، ومن لم يستطع فعليه بالصوم، فإنه له وجاء)[2]. واتە: ئەی لاوەكان هەر یەكێك لە ئێوە توانای هەیە با ژن بهێنێت، چونكە ژن هێنان دەبێتە هۆی چاوگرتنەوە لە سەیر كردنی حەرام و خۆپاراستن لە زیناكردن و بەدرەوشتی، ئەوەشی توانای نییە ژن بهێنێت با بەرۆژوو بێت، چونكە رۆژوو ئەو كەسە دەپارێزێت لە گونا هـ و تاوان و، هۆكارێكی گرنگە بۆ دامركاندنەوەی حەز و ئارەزووە ناپەسەندەكان.

ژنهێنان دەبێتە هۆی چاوگرتن لە سەیركردنی حەرام، پاكێتی و پاراستنی شەرەف و ناموس، ئەوەی ژنی هەبێ خشوعی زیاتر دەبێ، زیاتر روو دەكاتە خوا بە گەردن كەچییەوە، بەڵام بە پێچەوانەوە ئەگەر چاو نەگرێ لە حەرام و خۆی نەپارێزێ لە زینا ئەوە خشوعی نامێنێ بەتەواوی..

سەروەت و سامان موسڵمان بەكاری دەهێنێ بۆ چارەسەری نەخۆشییەكانی تەداوی خۆی پێدەكات، نەشتەرگەری پێ دەكات، شار بەشار و وڵات بە وڵات دەگەڕێ بۆ ئەوەی چارەسەری خۆی بكات ئەگەر توانای هەبوو، كە چارەسەری خۆشی كرد، ئەو كاتە جەستەی بەهێز دەبێ و بە ئاسانی دەتوانێ نوێژەكانی و عیبادەتەكانی تر ئەنجام بدات.

بەخشینی سەروەت و سامان لە لایەن خواوە بۆ نوێژ ئەنجام دان و زەكات دانە، بۆ یارمەتی دانی هەژاران و لێقەوماوانە، بەڵام بەداخەوە ئەوەی ئادەم ئەزانە و فەرامۆشی كردووە، ئەگەر پڕی شیوێكماڵی هەبوو هیوا و ئاواتەكانی هاتەدی، هەوڵ دەدات بۆ زیاتر و حەز دەكات بیكات بە دوان، ئەگەر گەیشت بە دوو شیو، حەز دەكات بیكات بەسیان تەنها بە گڵی گۆڕەكەی نەبێت كە دەیخەنە ناوی بە هیچ شتێك تێر ناخوات!.

---

(١) حسنه لغيره الألباني في الصحيح الترغيب والترهيب: (١٩١٦)، وفي الصحيحة: (٦٢٥).

(٢) صحيح البخاري : (١٨٠٦ )، جامع الصحيح: (٦/١١٧).

لەبیری خۆی دەباتەوە ئەو ماڵەی لە پێناوی ئەنجامدانی نوێژ پێی بەخشراوە، ئیتر ئەو ماڵە دەخاتە پرۆژەی گەورە گەورە و بازرگانی، وردە وردە لەناو دەریای ماددەدا نقوم دەبێ ئاخۆ چەند نوێژی دەفەوتێ لەو هەوڵ و کۆششە زیادەیەدا کە دەیدا بۆ شیوێ پڕ لە ماڵ و سامان، یاخود ئەگەر نوێژی نەفەوتابێ دەبێت چەندە خشوع و جەماعەتی فەوتا بێت؟ چەندە خێری لە دەست دەرچووبێت؟..

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (ما يسرني أن لي أحدا ذهبا. تأتي علي ثالثة وعندي منه دينار. إلا دينار أرصده لدين علي)[1]. ئەگەر بەقەد کێوی ئوحد ئاڵتونم هەبێ، پێم خۆش نییە سێ ڕۆژی بەسەریدا تێپەڕ ببێ و هیچیم لە لا مابێت، مەگەر تەنها ئەوە نەبێت بۆ قەرزێکم دانابێ تا بیدەمەوە بە خاوەنەکەی.

ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە موسڵمان هەوڵ نەدات و بە تەمەڵی لێی دانیشێ نەخێر دەبێ لە ڕێگەی حەڵاڵەوە هەوڵ بدات بەڵام هەڵپە نەکات بۆ ماڵی دنیا بە ماڵی حەرام خۆی دەوڵەمەند نەکات چونکە ئەوە دەبێتە بەڵا بۆی.

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (اليَدُ العُليا خيرٌ مِن يَد السُفلى..)[2]. واتە: ئەو دەستەی کاری پێ دەکرێت چاکتر و باشترە لەوەی کاری پێناکرێت و دەست پان دەکاتەوە.

# فەزڵی نوێژە فەرزەکان

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱرْكَعُواْ مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ﴾ البقرة: ٤٣. واتە: نوێژ بکەن و زەکات بدەن، لەگەڵ کڕنوش بەراندا کڕنوش بەرن.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِدُلُوكِ ٱلشَّمْسِ إِلَىٰ غَسَقِ ٱلَّيْلِ وَقُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ إِنَّ قُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا﴾ الإسراء: ٧٨. واتە: ئەی پێغەمبەر! نوێژ بەجێ بێنە لە کاتی لادانی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان هەتا هاتنی تاریکی شەو، هەروەها نوێژی بەیانی، بە ڕاستی قورئان خوێندنی نوێژی بەیانی هەمیشە دەبینرێت.

---

(١) أخرجه البخاري: (٢٣٨٩)، ومسلم: (٩٩١).

(٢) صحيح، سنن أبوداود: (١٣٢/٢).

بۆیە زۆربەی پێشەوا جەنگاوەرەکانی ئیسلام لە زۆربەی غەزاکاندا لە دوای نوێژی بەیانیەوە هێرشیان دەبردە سەر دوژمنانی خوا و ئایینەکەیان!.

* خوای گەورە لە فەرموودەی قودسیدا دەفەرموێت: (من عادى لي وليا فقد آذنته بالحرب وما تقرب إلي عبدي بشيء أحب إلى مما افترضته عليه وما يزال عبدي يتقرب إلي بالنوافل حتى أحبه..)[1]. واتە: هەر کەسێك دوژمنایەتی خۆشەویست و دۆستێکی من بکات، ئەوە ئیعلانی جەنگی لە دژ دەکەم و، خۆم دژایەتی دەکەم، بەندەی من بە هیچ وەسیلەیەك لە من نزیك نابێتەوە، وەك بە کردنی فەرزەکان لێم نزیك دەبێتەوە! بەردەوام بەندەی من لێم نزیك دەبێتەوە بەکردنی سوننەتەکان، سەرەڕای فەرزەکان، تا خۆشم دەوێت، کە خۆشیشم ویست دەیپارێزم لە هەموو خراپەیەك، سەرکەوتووی دەکەم بۆ هەموو چاکەیەك..

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿حَـٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ وَقُومُواْ لِلَّهِ قَـٰنِتِينَ﴾البقرة: ٢٣٨. واتە: ئاگاداری نوێژەکانتان بکەن، بە تایبەتی نوێژی ناوەراست، لە نوێژدا بوەستن بۆ خوا بە گەردن کەچی. (الصلاة الوسطى) مانای نوێژی عەسرە بە دەقی فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ[2].

خوای گەورە بەتایبەتی ناوی هێناوە لە قورئاندا، نوێژی عەسر کاتەکەی لە ناوەڕاستدایە، نوێژی بەیانی و نیوەڕۆی لە پێشەوەیە دوانیشی لە دواوەیە کە مەغریب و عیشایە هەرکەسێك تەرکی بکات ئەوە کردەوەکانی دەپچڕێت و بەبا دەچێ.

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (مَن تَرَكَ صلاةَ العَصرِ فقد حَبِطَ عَمَلَهُ)[3]. واتە: ئەوەی تەرکی نوێژی عەسر بکات کردەوەکانی دەپچڕێت.

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (مَنْ صَلَّى البَرْدَينِ دَخَلَ الجَنَّةَ)[4]. واتە: ئەوەی نوێژی بەیانی و عەسر بکات دەچێتە بەهەشتەوە.

---

(١) البخاري، جامع الصحيح: (٧/١٩٠)، ( ١٧٨٢).

(٢) رواه أحمد في مسند: (٥/ ١٢)، وابن خزيمة في صحيحه:(١٣٣٨).

(٣) أخرجه البخاري: (٥٥٣): واحمد في مسنده: (٥/ ٣٥٠).

(٤) (متفق عليه)، أخرجه البخاري: (٥٧٤)، ومسلم: (٢١٥).

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (لَنْ يلِجَ النَّارِ أَحَدٌ صَلَّى قَبْلَ طُلوعِ الشَّـــمْسِ وَقَبْلَ غُرُبِهَا)[1]. واتە: ئەوکەسەی نوێژی پێش خۆرکەوتن و نوێژی پێش خۆرئاوا بوون بکات نارِواتە ناو ئاگری دۆزەخەوە، مەبەست نوێژی بەیانی و عەسرە.

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ( يَتَعَاقَبُونَ فِيكُمْ مَلاَئِكَةٌ بِاللَّيْلِ وَمَلاَئِكَةٌ بِالنَّهَارِ، وَيَجْتَمِعُونَ فِي صَلاَةِ الْفَجْرِ وَصَلاَةِ الْعَصْرِ، ثُمَّ يَعْرُجُ الَّذِينَ بَاتُوا فِيكُمْ، فَيَسْأَلُهُمْ وَهْوَ أَعْلَمُ بِهِمْ كَيْفَ تَرَكْتُمْ عِبَادِي فَيَقُولُونَ تَرَكْنَاهُمْ وَهُمْ يُصَلُّونَ، وَأَتَيْنَاهُمْ وَهُمْ يُصَلُّونَ)[2]. واتە: چەند مەلائیکەیەك بە رۆژ و چەند مەلائیکەك بەشەو بە سەرتانەوەن لە نوێژی بەیانی و عەسردا یەکدەگرن و یەکتر دەگۆڕن، ئەوانەی شەو کاتێ سەردەکەونەوە بۆ حزوری پەروەردگار، لێیان دەپرسێ: (هەرچەندە خۆی باشتر ئاگادارە بەحاڵی بەندەکانی) دەفەرموێت: کاتێك ئێوە هاتنەوە بەندەکانی من چییان دەکرد؟. دەڵێن: کە ئێمە رۆشتین بۆ لایان نوێژیان دەکرد، کە هاتینەوە هەر نوێژیان دەکرد.

* پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (من صلى الصبح فهو في ذمة الله فلا يطلبنكم الله من ذمته بشيء فإن من يطلبه من ذمته بشيء يدركه ثم يكبه على وجهه في نار جهنم)[3]. واتە: هەرکەسێك نوێژی بەیانی بکا ئەوە لە پەنا و ئامانی خوادایە، کەواتە نەکەن ئازاری ئەو کەسە بدەن کە لە پەنای خوادایە، ئەگینا خوای گەورە داوای مافی ئەوکەسەتان لێ دەکات، ئەو کەسەش خوا داوای مافی وای لێ بکات لە دەستی دەرناچێ و بەڕوودا دەیگەوزێنێ لە ئاگری دۆزەخدا.

* عَنْ جَرِيرٍ قَالَ كُنَّا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فَنَظَرَ إِلَى الْقَمَرِ لَيْلَةً - يَعْنِي الْبَدْرَ - فَقَالَ: (إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ رَبَّكُمْ كَمَا تَرَوْنَ هَذَا الْقَمَرَ لاَ تُضَامُّونَ فِي رُؤْيَتِه ، فَإِنِ اسْتَطَعْتُمْ أَنْ لاَ تُغْلَبُوا عَلَى صَلاَةٍ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا فَافْعَلُوا » . ثُمَّ قَرَأَ ( وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ الْغُرُوبِ)[4]. واتە: شەوێ لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بووین، شەوی چواردە

---

(١) أخرجه مسلم: (٢١٣)، وأحمد في المسنده (٤/ ١٣٦).

(٢) أخرجه البخاري: (٥٥٥)، ومسلم: (٢١٠).

(٣) رواه مسلم: (٦٥٧)، تحقيق الألباني صحيح انظر حديث: ٦٣٣٩ في صحيح الجامع..

(٤) رواه البخاري: (٥٧٣)، ومسلم: (٦٣٣).

بوو، تەماشایەکی مانگی چواردەی کردوو فەرمووی: (چۆن ئێستا ئەو مانگی چواردەیە بە ئاسانی دەبینن لە قیامەتدا ئاوا خوای خۆتان دەبینن و لە بینینیدا توشی هیچ زەحمەتێ نابن، دەی بە ئومێدی شاد بوون بەو بەهرە گەورەیە تا دەتوانن ئاگاداری نوێژی بەیانی و عەسر بن و مەیان فەوتێنن). پاشان ئەو ئایەتەی سەرەوەی خوێندەوە.

کەواتە کردنی نوێژی بەیانی و عەسر دەبنە هۆی بینین و شادبوون بە دیداری خوای گەورە لە قیامەتدا، ئیتر چی لەوە چاکتر و باشترە، ئەوەش نیشانەی ئیمانداریە، ئەگینا کافر و بێ باوەڕەکان لە قیامەتیشدا بێبەشن لەو بەهرە گەورەیە کە بینینی خوای گەورە و پەروەردگاری هەردوو جیهانە.

* ئەبو هورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (لَيْسَ صَلَاةٌ أَثْقَلَ عَلَى الْمُنَافِقِينَ مِنَ الْفَجْرِ وَالْعِشَاءِ، وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِيهِمَا لأَتَوْهُمَا وَلَوْ حَبْوًا)[1]. واتە: قورسترین نوێژ لەسەر مونافیقەکان نوێژی عیشا و بەیانییە، ئەگەر بتانزانیایە چەندە خێریان تێدایە بە سنگە خشێش بوایە بۆی دەڕۆشتن، بە جەماعەت لە مزگەوتدا ئەنجامتان دەدا.

بێگومان مونافیقەکان لەبەر رووپامایی نوێژ دەکەن، نوێژی بەیانی و عیشاش تاریکە نابینرێن لەبەر ئەوە ئامادە نابن بۆ ئەو دوو نوێژە.

* عوسمانی کوڕی عەففان (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (مَنْ صَلَّى العشَاءَ فِي جَمَاعَةٍ، فَكَأَنَّمَا قَامَ نِصفَ اللَّيلِ، وَمَنْ صَلَّى الصُبحَ فِي جَمَاعَةٍ، فكَأَنَّما صَلَّى الَّيلَ كُلَّهُ)[2]. واتە: هەرکەسێك لە ئێوە نوێژی عیشا بکات بە جەماعەت، وەك ئەوە وایە تا نیوە شەو شەونوێژی کردبێ، هەرکەسێکیش نوێژی بەیانی بە جەماعەت بکات وەك ئەوە وایە نیوەکەی تری شەو نوێژی کردبێ.

* مەعاویە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (مَنْ فاتَتهُ صلاة، فَكَأَنَّما وُتِرَ أَهْلَهُ وَمَالَهُ)[3]. واتە: هەرکەسێك نوێژێك لە نوێژە فەرزەکان نەکات و

---

(١) أخرجه البخاري: (٦٥٧) تحفة (١٢٣٦٩).و مسلم: (٢٥٢).

(٢) مسلم: (٦٥٦)، وأبوداود: (١٤٨)، وأحمد في مسنده: (١/ ٥٨).

(٣) أخرجه إبن حبان في صحيحه وصححه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب: (٥٧٧).

بیفەوتێنێ، وەك ئەوە وایە هەرچی سەروەت و سامان و ماڵ و منداڵ و کەس و کاری هەیە لەدەستی بدات.

ئەوە بۆ یەك نوێژ ئەی ئەگەر کەسێك نوێژ نەکات دەبێ حاڵی چی بێ؟!.

جا چۆنە بەلاتەوە کاتێك جگەرگۆشە خۆشەویستەکەت لە دەست دەردەچێ، چەندە سەختە چەندە هەست بەغەم و پەژارە دەکەیت، یان ئەو کەس و کارو خێزان و خۆشەویستانەت کە لەگەڵیان دەژی کاتێك لێیان جیادەبێتەوە بە مردنیان چەندە کاریگەریان هەیە لەسەر دڵ و دەروونت، یان ئەو سەروەت و سامانەی کە خۆشەویستە لە دڵتدا، ئەگەر ئەمانەت لە دەست چوو ئەو زەوییە فراوانەت لەبەر تەسك دەبێتەوە و نارامی و بەختەوەریت نامێنێ، دەی فەوتاندی یەك نوێژ وەك نەمانی ئەوانە هەموویان وایە.

# زیکرو یادی خوا

وشەی(الذکر) لە شەرعدا واتە: زیکر و یادی خوا، هەروەها ئەمانەش دەگرێتەوە، نوێژکردن، قورئان خوێندن، تەسبیحات کردن، نزا و پاڕانەوە، سوپاسگوزاری، گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری[1].

زانایان کۆڕی زیکر و یادی خوایان بە تەنها قۆرغ نەکردووە بۆ(سبحان الله)و، (الحمد لله) و، (لا اله الا الله) و، (الله اکبر)، بەڵکو بە هەموو کۆڕێکی زانستی کە لێکۆڵینەوەی تێدا بکرێ لە بواری حەڵاڵ و حەرام، فیقهی شەرعی، کاروباری حوکم، تاعەت و عیبادەت، ئەمانە هەموویان بە زیکر و یادی خوا داناوە[2].

زیکرو یادی خوا چەند قۆناغێك و جۆرێکی هەیە بەگوێرەی ئامادە بوون و بێداری دڵ لەگەڵ زمان، یان یەکێکیان بە تەنها و بەدەر لەوی تریان.

پێشەوا نەوەوی (رەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرموێت: زیکر و یادی خوا پێویستە بەدڵ بکرێت، یان بە زمان، بەڵکو بە هەردوکیان بێت باشتر و چاکترە، ئەگەر تەنها بە یەکێکیان بوار هەبوو بکرێت ئەوا بە دڵ بکرێت چاکترە.

---

(١) إبن المنظور، لسان العرب: ٣٠٨/٤، ٣١١.

(٢) الأذكار: لإمام النووي.

زیکر و یادی خوا دڵ دەبوژێنێتەوە، قوتی ڕۆحە، پاککردنەوەی زەینە، چاککردنی ڕەفتار و هەڵس و کەوتە، دڵ پێی ئارام و دامەزراو دەبێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَلَا بِذِكْرِ اللَّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ﴾ الرعد: ٢٨.

بێگومان ترسناکترین شت کردەوەی چاکی مرۆڤ لەکیس بدات زمانە، بۆیە پێویستە لەسەری بە وتەی چاك نەبێت پێی نەدوێ و ئاگاداری وتەکانی بێت، چونکە هەموویان تۆمار دەکرێن لە نامەی کردەوەکانیدا، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ﴾ ق: ١٨. واتە: هیچ وتەیەك لە دەمی ئادەمیزاد دەرناچێ ئیللا مەلائیکەیەك چاودێر و گوێ بیستی قسەکەیەتی و تۆماری دەکات.

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (لا يستقيم إيمان عبد حتى يستقيم قلبه ولا يستقيم قلبه حتى يستقيم لسانه)[1]. واتە: بیرو باوەڕی هیچ کەسێك دانامەزرێ هەتا دڵی دانەمەزرێت، دڵیشی جێگیر نابێت هەتا زمانی جێگیر نەبێت.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اذْكُرُوا اللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا ﴿٤١﴾ وَسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا﴾ الأحزاب: ٤١ . واتە: ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوە زۆر زۆر زیکر و یادی خوا بکەن، بە دڵ و بە زمان هەمیشە خواتان لەیاد بێت، ئێواران و بەیانیان سوپاس و ستایشی خوا بکەن و بەپاکی و بەرزی دوور لە هەموو عەیبە و کەم و کورتییەك ناوی بهێنن.

ئیبن عەبباس (ڕەزای خوای لەسەر بێ) لە ڕاڤەی ئەم ئایەتە پیرۆزەدا دەڵێت: خوای گەورە هەر شتێکی فەرز کردبێت لەسەر بەندەکانی، سنوورێکی دیاریکراوی بۆ داناوە، ڕوخسەتی داون لە هەندێك کات و حاڵەتدا، بەڵام زیکر و یادی خوا هیچ سنوورێکی بۆ دانانەوە و دەبێت لە هەموو کات و حاڵەتەکاندا بکرێن جا ئیتر بە پێوە بێت یان بە دانیشتنەوە یان بەڕاکشانەوە بێت: ﴿الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ قِيَاماً وَقُعُوداً وَعَلَىَ جُنُوبِهِمْ﴾. بە شەو و بە ڕۆژ، لە دەریا و وشکاییدا، لە ماڵ و لە سەفەردا، لە کاتی دەوڵەمەندی و

---

(١) حسن رواه أحمد وابن أبي الدنيا، سلسلة الأحاديث الصحيحة: ٢٨٤١.

هەژاری، لەش ساغی و نەخۆشی، بە نهێنی و بە ئاشکرا، لە هەموو حاڵەتێکدا زیکر و یادی خوا دەبێت بکرێت.

لەبەیانیان و ئێواراندا تەسبیحات و زیکر و یادی خوا زۆر بکەن..ئەگەر واتانکرد خوای گەورە ڕەحمەتی خۆی دەبارێنێت بەسەرتاندا و مەلائیکەکەش داوای لێ خۆشبوونتان بۆدەکەن: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى يُصَلِّى عَلَيْكُمْ وَمَلَٰٓئِكَتُهُۥ لِيُخْرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ۚ وَكَانَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَحِيمًا ﴾ الأحزاب: ٤٣.

قورئان خوێندن بە ڕەوانی بەرزترین و چاکترین جۆری زیکرکردنە، پاداشتێکی گەورەی هەیە، سەرنج ڕاکێشە، هیدایەت بەخشە چونکە کەلامی خوایە، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَهْدِى لِلَّتِى هِىَ أَقْوَمُ وَيُبَشِّرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا ﴾ الإسراء: ٩.

باشترین حاڵەتی زیکرکردن ئەوەیە بە دڵ و بە زمان بە هۆشیارییەوە بکرێ، چونکە ئەوە ناسینی خوا و خۆشەویستی بەدەست دەهێنێ و، پاداشتیشی زۆر زۆرە، یادی خوا چڵە پۆپەی سوپاسگوزارییە، خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ فَٱذْكُرُونِىٓ أَذْكُرْكُمْ وَٱشْكُرُوا۟ لِى وَلَا تَكْفُرُونِ ﴾ البقرة: ١٥٢.

* خوای گەورە لە فەرمودەی قودسیدا دەفەرموێت: (من ذكرني في نفسه ذكرته في نفسي، ومن ذكرني في ملا ذكرته في ملا خير منه)[1]. ئەوەی لە دڵی خۆیدا یادم بکات، منیش لای خۆم ناوی دەبەم، هەر کەسیش لە کۆمەڵدا زیکر و یادی من بکات، ئەوا منیش لەناو کۆمەڵێکی باشتر و چاکتردا کە(مەلائیکەکان) باسی ئەو دەکەم.

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: پێتان بڵێم چاکترین کردەوەتان لەلای خواوەندتان کە گەورەترین پاداشتتان دەداتەوە لەسەری و پلەتان پێی بەرز دەبێتەوە لەلای چییە؟ باشتر بێ لە بەخشینەوەی زێڕ و زیو بۆتان، تەنانەت چاکتریش بێت بۆتان لە بەرەنگاربوونەوەی دوژمن و جیهاد و تێکۆشان لە دژی کافران و بە شیر و تیر و چەك دان

---

(١) فتح الباري: (٣٩٥/١٣)، وأخرجه أحمد في مسنده : (٣٥٤/٢).

لەگەردنیان، یان لە پێناوی شەریعەتی خوادا بیانکوژن؟ وتیان: ئەوە چییە ئەی پێغەمبەری خوا؟! فەرمووی: یادی خوایە بەدڵێکی هۆشیارەوە[1]..

* پیاوێك پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ وتی شەریعەتی ئیسلام فراوانە و فەرمانەکانی زۆرن شتێکم فێربکە باخۆمی پێوە خەریك بکەم و بەردەوام بم لەسەری؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (لایزال لسانك رطبا بذكر الله تعالی)[2]. واتە: با هەمیشە و بەردەوام زمانت پاراوبێت بە زیکر و یادی خواوە.

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: باشترین زیکر و یادی خوا (لا إله إلا الله)یە، چاکترین پارانەوەش (الحمد لله)یە[3].

* ئیبن قەیم (بەرەحمەت بێ) زیاد لە سەد فائیدە و سوودی زیکر و یادی خوای باسکردووە لە کتێبی (وابل الصيب من الكلم الطيب)دا لەوانە حەفتاو نۆیانی لە قورئان و سوننەت دەرهێناوە: زیکر و یادی خوا هۆی راونانی شەیتان و هەڵهاتنیەتی، رازیکردنی خوای گەورەیە، رەواندنەوەی غەم و پەژارە و پەستی دڵەکانە، هۆی بەهێز کردنی دڵ و جەستەیە، گەشانەوەی دڵ و رووخسار و رووناك کردنەوەیانە، بەدەست هێنانی کامەرانی و رزق و رۆزیە، خۆشەویستی خوا دەخاتە دڵەوە، خاوەنەکەی بەردەوام هەست بە چاودێری خوا دەکات بە سەریەوە، زوو زوو دەگەڕێتەوە بۆ لای خوا و پەشیمان دەبێتەوە، زانست و زانیاری زۆر دەبێت، هەیبەت و ترسی خوا دەخاتە دڵەوە، دڵ دەژێنێتەوە، قوتی رۆح و دڵە، پاککەرەوەی دڵە لەو ژەنگ و پیسییەی کە بەهۆی بێئاگای و هەواوە توشی دێت، هۆکاری دڵنیای و ئارامییە، دڵ سەرقاڵ دەکات تا بواری نەبێت خۆی خەریك بکات بە غەیبەت و درۆ و قسەی پرو پووچ و بەتاڵ و قسە هێنان و قسە بردن و دوو زمانی کردنەوە، ئەو کەسەی یادی خوا دەکات کۆڕ و دانیشتنەکەی پیرۆزە و مایەی خۆشحاڵییە، بەندە ئارامە و پەروەردگاری لە بیر ناکات بەربەستی دڵ دەکات لە هەژاری و تەنهایی و دەوڵەمەندی دەکات لەوەی پێویستی بە خەڵك بێت، شیفایە بۆ دڵ و دەرمانێکی یارمەتیدەرە بۆ

---

(١) أخرجه الترمذي: ٣٣٧٨، وأحمد في مسند: ٣٧٥/٥، وابن ماجه: ٣٧٩.

(٢) اخرجه الامام احمد ، والترمذي: ٢٣٧٥، وابن ماجه: ٣٧٩.

(٣) رواه الترمذي: ٤٦٢/٥، وابن ماجه: ١٢٤/٢ وصححه ووافقه الذهبـــي.

ئاسانکردنی تاعەت و عیبادەت و، خۆشەویست دەبێت لای، تەنگ و چەڵەمە و نەهامەتی ئاسان دەکات، بەهێز دەبێ لە بەرامبەر زەبر و زەنگی ژیان..

شێوەکانی زیکر و یادی خوا زۆرن بە زمان دەوترێن هەرکاتە و هەرحاڵەتە زیکر و یادی تایبەتی خۆی هەیە، پێویستە لە کاتی خۆیاندا بخوێنرێن، بۆ ئەوەی دڵی موسڵمان هەمیشە و بەردەوام پابەند بێت بە خوای خۆیەوە و غافڵ نەبێت، هەروەها زمانی پاراو بێت پێیانەوە..خوێندنی زیکرەکانی ئێواران و بەیانیان دەبێت لە ئێواران و بەیانیاندا بخوێنرێن، زیکر و یادی کاتی خەوتن و هەستان لە خەو، پۆشاك لەبەرکردن، چوونە مزگەوت و هاتنە دەرەوە، کاتی سواربوون، باران بارین، رەشەبا و هەورە بروسکە. بۆ زیاتر ئاشنابوون لەو بوارەدا سەیری کتێبی (الأذکار)ی پێشەوا نەوەوی بکەن

## زیکرو یادەکانی کاتی خەوتن:

ئەمانە سونەتن پێش خەوتن: دەستنوێژگرتن، خەوتن لەسەر لای راست و روو بە قیبلە، دەست خستنە ژێر روومەتی لای راست.

١- خوێندنی(آية الكرسي) بۆ راونانی شەیتان:﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُ ﴾ البقرة: ٢٥٥. [١].

٢- فو بکات بەناو دەستی داو پاشان ئەم سێ سورەتە بخوێنێ و دەستی بێنێ بە جەستەیدا تا کوێ دەستی دەگات: ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ ﴾،﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ﴾، ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴾[٢]. یەکی سێ جار، بۆ خۆپاراستن لە جنۆکە و چاوی پیس و جاد و سیحر.

٣- خوێندنی: دوو ئایەتی کۆتایی سورەتی (البقرة)[٣].

٤- خوێندنی: (باسمك اللهم أموت وأحيا)[٤] یەك جار.

---

(١) أخرجه البخاري مع الفتح: ٤٨٧/٤.

(٢) أخرجه البخاري مع الفتح:٦٢/٩، ومسلم: ١٧٢٣/٤.

(٣) أخرجه البخاري مع الفتح: ٩٤/٩، ومسلم: ٥٥٤/١.

(٤) أخرجه البخاري مع الفتح: ١١٣/١١، ومسلم: ٢٠٨٣/٤.

٥- خوێندنی: (سبحان الله)٣٣جار، ( الحمد لله) ٣٣جار، (الله أكبر) ٣٤جار[١].

٦- خوێندنی: (اللهم قني عذابك يوم تبعث عبادك)[٢] ٣جار.

٧- خوێندنی: (اللهم رب السماوات السبع ورب العرش العظيم ربنا ورب كل شيء منزل التوراة والإنجيل والقرآن فالق الحب والنوى أعوذ بك من شر كل شيء أنت آخذ بناصيته أنت الأول فليس قبلك شيء وأنت الآخر فليس بعدك شيء وأنت الظاهر فليس فوقك شيء وأنت الباطن فليس دونك شيء أقض عني الدين وأغنني من الفقر)[٣].

٨- لەكاتی راكشاندا خوێندنی: (باسمك ربي وضعت جنبي وبك أرفعه فإن أمسكت نفسي فارحمها وإن أرسلتها فاحفظها بما تحفظ به عبادك الصالحين)[٤].

٩- خوێندنی ئەم دوعایە لە کۆتایدا:(اللهم أسلمت نفسي إليك ووجهت وجهي إليك وفوضت أمري إليك وألجأت ظهري إليك رغبة ورهبة إليك لا ملجأ ولا منجا منك إلا إليك آمنت بكتابك الذي أنزلت وبنبيك الذي أرسلت)[٥].. ئەو کەسەی ئەم دوعایە بخوێنێ ئەگەر بمرێ لەو شەوەدا لەسەرۆ فیترەت دەمرێ واتە بە ئیمانەوە دەمرێت.

### زیکر و یادەکانی کاتی هەستان لەخەو:

١- خوێندنی: (الحمد لله الذي أحيانا بعد ما أماتنا وإليه النشور)[٦].

٢- خوێندنی: (الحمد لله الذي عافاني في جسدي ورد علي روحي وأذن لي بذكره)[٧]

٣- خوێندنی: (لا إله إلا الله وحده لا شريك له له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير الحمد لله وسبحان الله ولا إله إلا الله والله أكبر ولا حول ولا قوة إلا بالله العلي

---

(١) أخرجه البخاري مع الفتح:٧/٧١، ومسلم: ٤/٢٠٩١.

(٢) صحيح سنن الترمذي: ٣/١٤٣، أبوداود: ٤/٣١١.

(٣) رواه مسلم: ٤/٢٠٨٤.

(٤) أخرجه البخاري:١١/١٢٦، ومسلم: ٤/٢٠٨٤.

(٥) أخرجه البخاري مع الفتح:١١/١١٣، ومسلم: ٤/٢٠٨١.

(٦) أخرجه البخاري: ١١/١١٣، ومسلم: ٤/٢٠٨٣.

(٧) صحيح جامع الترمذي: ٥/ ٤٧٣.

العظيم.) پاشان بلَیّ: (اللهم اغفر لي)[1]. یان هەر دوعایەك بكات خوا لێی قبولْ دەكات ئەگەر دەستنوێژی گرت و نوێژیشی كرد ئەوە نوێژەكەی قبولّە و وەرگیراوە.

## خوێندنی زیكرەكانی ئێواران و بەیانیان:

١- خوێندنی(آية الكرسي):﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُ ﴾[2]. هەركەس بیخوێنیّ لە جنۆكە دەپارێزریّ.

٢- خوێندنی هەر سیّ سورەتی: (﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ﴾،﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾، ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾[3]. یەكی سیّ جار.

٣- خوێندنی: (اللهم إني أسألك العافية في الدنيا والآخرة اللهم أسألك العفو والعافية في ديني ودنياي وأهلي ومالي اللهم استر عوراتي وآمن روعاتي اللهم احفظني من بين يدي ومن خلفي وعن يميني وعن شمالي ومن فوقي وأعوذ بعظمتك أن أغتال من تحتي)[4].

٤- خوێندنی: (بسم الله الذي لا يضر مع اسمه شيء في الأرض ولا في السماء وهو السميع العليم)[5] ٣جار.

٥- خوێندنی: (اللهم عالم الغيب والشهادة فاطر السموات والأرض رب كل شيء ومليكه أشهد أن لا إله إلا أنت أعوذ بك من شر نفسي وشر الشيطان وشركه وفي رواية : وأن أقترف على نفسي سوءا أو أجره إلى مسلم)[6].

٦- خوێندنی (سيد الاستغفار) : (اللهم أنت ربي لا إله إلا أنت خلقتني وأنا عبدك وأنا على عهدك ووعدك ما استطعت أعوذ بك من شر ما صنعت أبوء لك بنعمتك علي

---

(١) البخاري مع الفتح: ٣٩/٣.

(٢) أخرجه الحاكم: ٥٦٢/١، وصححه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب: ٢٧٣/١.

(٣) أخرجه أبوداود: ٣٢٢/٤ ، صحيح الترمذي: ٥٦٧/٥.

(٤) أخرجه أبوداود، صحيح إبن ماجه: ٣٣٢/٢.

(٥) أخرجه أبوداود: ٣٢٣ ، صحيح الترمذي: ٤٦٥/٥

(٦) حسن صحيح، أخرجه أبوداود، صحيح الترمذي: ١٤٢/٣.

وأبوء بذنبي فاغفر لي فإنه لا يغفر الذنوب إلا أنت) . من قالها حين يمسي فمات من ليلته دخل الجنة ومن قالها حين يصبح فمات من يومه دخل الجنة)[1].

**٧- خوێندنی:** (اللهم بك أصبحنا وبك أمسينا وبك نحيا وبك نموت وإليك النشور )[2].

**٨- خوێندنی:** (أمسينا وأمسى الملك لله والحمد لله لا إله إلا الله وحده لا شريك له له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير رب أسألك خير ما في هذه الليلة وخير ما بعدها وأعوذ بك من شر ما في هذه الليلة وشر ما بعدها رب أعوذ بك من الكسل وسوء الكبر رب أعوذ بك من عذاب في النار وعذاب في القبر)[3].

**٩- خوێندنی:** (سبحان الله وبحمده)[4] **سەد جار.**

**١٠- خوێندنی:** (أعوذ بكلمات الله التامات من شر ما خلق)[5]. **ئێواران سێ جار.**

**١١- خوێندنی:** (يا حي يا قيوم برحمتك أستغيث وأصلح لي شأني كله ولا تكلني إلى نفسي طرفة عين أبدا)[6].

**١٢- خوێندنی:** (لاإله إلا الله وحده لاشريك له له الملك وله الحمد يحيي ويميت وهو على كل شيء قدير)[7]. **ده جار یان سەد جار.**

**١٣- له كۆتاییدا ده جار سلاّوات بدرێ له دیداری پێغەمبەری خوا ﷺ[8].**

**سەید قوتب** (رەحمەتی خوای لێ بێ) **دەڵێ: زیكر و یادی خوا ئارامی و دامەزراوی و دڵگەشییە، ئەمانەش دەگرێتەوە: دڵخۆشبوونە بە پەیوەندی بە خواوە، سەلامەتییە لە شپرزەیی و گومان و رارایی، ئارامی و دامەزراوییە لەسەر ئیمان، زانینی مەسیر و**

---

(١) صحيح، أخرجه البخاري: ٧/١٥٠.

(٢) صحيح الترمذي: ٣/١٤٢.

(٣) رواه مسلم: ٤/ ٢٠٨٨.

(٤) حسن صحيح، أخرجه أبوداود، صحيح الترمذي: ٣/١٤٢.

(٥) صحيح إبن ماجه: ٢/٢٦٦، صحيح الترمذي: ٣/٣٨٧.

(٦) سلسلة الصحيحة: ١/٤٤٩برقم: ٢٢٧.

(٧) سلسلة الصحيحة: ١/١٣٤برقم:٢٥٦٣.

(٨) مجمع الزوائد: ١٠/١٢٠، وصححه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب: ١/٢٧٣.

سەرەنجامە، دەرككردنە بە حیكمەتی هێنانە بوون، ئارام گرتنە لەسەر مەینەتیی و نەهامەتیەكان، سوپاسگوزاری ناز و نیعمەتەكانە..

پیاوێك وتی بە حەسەنی بەصری (رەحمەتی خوای لێ بێ): شكاتی دڵ رەقی خۆم لای تۆ دەكەم؟. فەرمووی: بە زیكر و یادی خودا بیتوێنەوە و نەرمی بكە.

## دوعاو پاڕانەوە

دوعاو پاڕانەوە خۆی لە خۆیدا عیبادەتێكی سەربەخۆیە و، لە لایەكەوە زەبونی و بێدەسەڵاتی بەندەكان دەردەخات، لە لایەكی تریشەوە هێز و دەسەڵاتی پەروەردگار و ئاشنا بوون و تێفكران لە سیفەتە بەرز و ناوە جوان و پیرۆزەكانی.

خوای گەورە پێی خۆشە بەندەكانی لێی بپاڕێنەوە و هاواری بۆ ببەن: ﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدْعُونِىٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِى سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ﴾ غافر: ٦٠. واتە: ئێوە هانا و هاوار بۆ من بێنن ، منیش دوعا و پاڕانەوەتان گیرا دەكەم، بێگومان ئەوانە خۆ بە گەورە دەزانن لە پەرستنم بە تەنیا، بە سەرشۆڕی و بە بچوكی دەچنە ئاگری دۆزەخەوە.

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (الدُّعَاء هُوَ العِبادَة)[1]. واتە: دوعا و پاڕانەوە بەندایەتییە.

* پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژەی پێداوە لەم فەرمودەیەدا: (من لم يسأل الله يَغضب عليه)[2]. واتە: هەر كەسێك نەپاڕێتەوە لە خوای گەورە لێی تورە دەبێ و خەشمی لێ دەگرێ.

### مەرجەكانی گیرابوونی پاڕانەوە:

١- راستەوخۆ پاڕانەوە لە خوای گەورە، چونكە خوای گەورە نزیكە لە بەندەكانیەوە: ﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِى عَنِّى فَإِنِّى قَرِيبٌ ۖ أُجِيبُ دَعْوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِ ۖ فَلْيَسْتَجِيبُوا۟ لِى وَلْيُؤْمِنُوا۟ بِى لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ﴾ البقرة: ١٨٦.

---

(١) رواه ابوداود: (٢/٧٨) والترمذي: ( ٢/٢١١)، وإبن ماجه: (٢/١٢٥٨).

(٢) رواه الترمذي: (٣٢٤٧) وأحمد في مسنده: (٤/٢٧١).

پێویستە خواردن و خواردنەوە و جل و بەرگی حەلال بێ، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (الرجل يطيل السفر أشعث أغبر يمد يديه إلى السماء يا رب يا رب ومطعمه حرام ومشربه حرام وملبسه حرام وغذي بالحرام فأنى يستجاب لذلك)(١). واتە پیاوێك سەفەرێكی دوور و درێژ دەكات، قژی ئالۆزاو دەبێ و دەم و چاوی تۆز و خۆڵاوی لێ نیشتووە و تۆزاویە، دەست بەرز دەكاتەوە بۆ ئاسمان و دەپارێتەوە دەڵێ: ئەی پەروەردگارم ئەی پەروەردگارم: بەڵام خواردن و خواردنەوە و جل و بەرگەكەی حەرامە، بە حەرام تێر بووە لە خۆراك، دەی ئیتر چۆن پاڕانەوەكانی گیرا دەبێت.

٣- دوعایەك نەبێ بۆ تاوان و پچڕاندنی سیلەی رەحم و پەیوەندی خزمایەتی، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (لا يزال يستجاب للعبد ما لم يدع بإثم أو قطيعة رحم..)(٢).

٤- دوعای خراپە لە خۆی و ماڵ و منداڵی نەكات نەوەكا رێككەوتی ئەو كاتانە بكات كە خوای گەورە دوعای تێدا گیرا دەكات: (لا تدعوا على أنفسكم ولا تدعوا على أولادكم ولا تدعوا على خدمكم ولا تدعوا على أموالكم لا توافقوا من الله ساعة يسأل فيها عطاء فيستجيب لكم)(٣).

٥- دەبێت پەلە نەكرێ لە گیرا بوونی دوعا و پاڕانەوەدا ئەگەر نیاز حاصڵ نەبوو، وەك بڵێ: دوعام كرد بەڵام گیرا نەبوو، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (يستجاب لاحدكم ما لم يعجل يقول دعوت فلم يستجب لي)(٤).

٦- بە دڵێكی بە ئاگاوە بپارێتەوە و دڵنیا بێت لەوەی خوای گەورە لێی قبوڵ دەكات، بێگومان ئەگەر مەرجەكانی تێدا بوو هەر گیرا دەبێت ئیتر لە دنیادا هەیان لە قیامەت، یان ئەوەتا خوای گەورە بەلایەكی لەسەر لادەبات.

(١) حديث حسن، صحيح الجامع: (٢٧٤٤)، ومسلم في الزكاة: (١٠١٥).
(٢) رواه مسلم (٦٨٧١).
(٣) صحيح، صحيح الترغيب والترهيب، رواه مسلم في الزهد (٣٠٠٩).
(٤) متفق عليه: البخاري: (٦٣٣٩)، ومسلم في الذكر والدعاء (٢٧٣٥).

ئیبن قەیم (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: ئەوەی دوعاکانی بە دڵێکی بە ئاگاوە نەخوێنێ، وەك ئەو تیرەی لێ دێت کە بە خاوی لە کەوانەکەی دەردەچێت.

## کاتەکانی دوعا گیرابوون :

لە پاش نوێژە فەرزەکان، لە نێوان بانگ و قامەتدا، سێیەکی کۆتایی شەو، کاتی ناو سەجدەی نوێژ، کاتی ڕۆژوو شکاندن، شەوی قەدر، کاتی باران بارین، لە مەیدانی جیهاد و تێکۆشاندا، پاڕانەوەی زوڵم و ستەم لێکراو، پاڕانەوەی موسڵمان بۆ موسڵمان، پاڕانەوەی ڕۆژی عەرەفە، کاتێکی دیاری نەکراو لە ڕۆژی هەینی و دوا کاتەکانی پاش نوێژی عەسری ئەو ڕۆژە، دوای قورئان خوێندن و، کاتی کۆبوونەوە بۆ کۆڕی زیکر و یادی خوا..

* سێیەکی کۆتایی شەو، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (ينزل ربنا تبارك وتعالى كل ليلة إلى سماء الدنيا حين يبقى ثلث الليل الآخر فيقول من يدعوني فأستجيب له من يسألني فأعطيه من يستغفرني فأغفر له)[1].

* کاتی ناو سەجدەی نوێژ، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (أقرب ما يكون العبد من ربه وهو ساجد فأكثروا الدعاء، )[2]. واتە: نزیکترین کات و شوێنی بەندە لە پەروەردگاریەوە کاتی سەجدەیە بۆیە دوعای زۆر تێدا بکەن.

* لە نێوان بانگ و قامەتدا دوعا نادرێتە دواوە: (لا يُرَدُّ الدعاء بين الآذان ولإقامة)[3].

### ئادابەکانی پاڕانەوە:

بە دەستنوێژەوە ڕوو بە قیبلە بێ، بە نهێنی بێ، هەردوو دەستی بە زەلیلی و ملکەچییەوە بەرزبکاتەوە بۆ بارەگای خوای گەورە، سوپاس و ستایشی خوا بکات، پاشان سڵاوات بدات لە دیداری پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ بە ناوە پیرۆزەکانی خوای گەورە

(١) صحيح سنن أبي داود: (٣٤/٢) (١٣١٥).

(٢) رواه مسلم: (١٠٨٣).

(٣) صحيح سنن أبي داود: (١٤٤/١) (٥٢١).

بپاڕێتەوە وەك: (يا أرحم الراحمين)، (يا ذالجلال والإكرام).. دووپات کردنەوەی دوعاکان، لە کۆتاییشدا سلاوات بدات لە دیداری پێغەمبەری خۆشەویستمان. هەروەها ئەو دوعایانە بکات کە پێغەمبەری خوا ﷺ کردوونی وەك:

* (اللهُمَّ رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ).

* ﴿ قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴾ الأعراف: ٢٣.

* ﴿ رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً ۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْوَهَّابُ ﴾ آل عمران: ٨.

* ﴿ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لِى وَلِوَٰلِدَىَّ وَلِلْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ يَقُومُ ٱلْحِسَابُ ﴾ إبراهيم: ٤١.

* (يا مُقلبَ القُلوب ثبت قَلبَنا على دينك).

* (اللّهم إني أسالُك الهُدى والتُقى والعفاف والغنى).

* (اللّهم إني أسالُك الجنّة وأعوذ بك من النار).

* (اللّهم إني أسالُك الهُدى والسداد).

* (اللّهم إني أسالُك من خير كُلّه وأعوذ بك من شَرّ كُلّه)..

# نوێژ لەڕووی زانستی پزیشکییەوە

## ١- پاك و خاوێنی (الطَّهارة):

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ إِلَى ٱلۡمَرَافِقِ وَٱمۡسَحُواْ بِرُءُوسِكُمۡ وَأَرۡجُلَكُمۡ إِلَى ٱلۡكَعۡبَيۡنِۚ وَإِن كُنتُمۡ جُنُبٗا فَٱطَّهَّرُواْۚ وَإِن كُنتُم مَّرۡضَىٰٓ أَوۡ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوۡ جَآءَ أَحَدٞ مِّنكُم مِّنَ ٱلۡغَآئِطِ أَوۡ لَٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمۡ تَجِدُواْ مَآءٗ فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدٗا طَيِّبٗا فَٱمۡسَحُواْ بِوُجُوهِكُمۡ وَأَيۡدِيكُم مِّنۡهُۚ مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجۡعَلَ عَلَيۡكُم مِّنۡ حَرَجٖ وَلَٰكِن يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمۡ وَلِيُتِمَّ نِعۡمَتَهُۥ عَلَيۡكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ﴾ المائدة: ٦. واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە کاتێك هەستان بۆ نوێژکردن، ئەوە رووخسارتان بشۆن ، هەروەها دەستەکانتان تا ئانیشکەکانتان، پاشان دەستی تەڕ بهێنن بە سەرتاندا، پێکانتان بشۆن تا هەردوو قولەپێتان، ئەگەر لەش گران بوون ئەوە خۆتان بشۆن و خۆتان خاوێن بکەنەوە، ئەگەر نەخۆش بوون یان لەسەفەردا بوون، یان چوونە سەرئاو، یان چوونە لای هاوسەرتان ئاوتان دەست نەدەکەوت بۆ خۆشتن یان دەستنوێژ گرتن ئەوە تەیەممومم بکەن بە خاکێکی پاك، ناولەپتان بدەن لە خۆڵە پاکەکە و بیهێنن بە دەم و چاوتاندا بەو تۆز و خۆڵە پاکە، خوا کارتان بۆ ئاسان دەکات و نایەوێت توشی سەغڵەتی و زەحمەتتان بکات، بەڵکو دەیەوێت پاك و خاوێنتان بکات و بەهۆی گوێڕایەڵی ملکەچ کردنتان بۆ فەرمانەکانی، خوا ناز و نیعمەتی خۆیتان بەسەردا برێژێت بۆ ئەوەی سوپاس گوزاربن.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلۡمُتَطَهِّرِينَ﴾ البقرة: ٢٢٢. واتە: بەڕاستی خودا تەوبەکارانی خۆش دەوێت، ئەوانەشی خۆش دەوێت کە خۆیان بە پاکی رادەگرن.

خوای گەورە لە قورئاندا چەندەها جار باسی پاك و خاوێنی دووبارە کردووەتەوە لە

بەر گرنگییەکەی، هەروەها فەرزی کردووە لەسەر موسڵمانان کە دەستنوێژ بگرن بۆ نوێژەکانیان، وە لە چەندەها شوێندا فەرزە لەسەریان خۆیان بشۆن وەك دوای لەش گرانی و جووت بوون لەگەڵ هاوسەر، یان دوای پاك بوونەوەی ئافرەت لە خوێنی حەیز و زەیستانی پاك بوونەوە دوای منداڵ بوون، یان دوای ئەوەی یەکێك بیەوێ ئیمان بهێنێ و بێتە ناو ئاینی پاکی ئسلامەوە، پێویستە لەسەری خۆی و پۆشاك و جل و بەرگەکانی پاك بشوات.

* پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (الطُّهُورُ شَطْرُ الإيمانِ..) [1]. واتە: پاك و خاوێنی نیوەی ئیمانە..

ئەمەش پاك و خاوێنی جل و بەرگ و ئاو و، خاك و خۆڵی تەیەمموم و، پاك و خاوێنی دڵ و دەروونیش دەگرێتەوە لە هاوەڵ و شەریك بۆ خوا دانان و گومان و دوودڵی و غەل و غەش و رق و کینە لە موسڵمانان، پاککردنەوەی لایەنی مەعنەوی و ئەو شتانەی کە پێنج هەستەکە هەستی پێ دەکەن، نیوەکەی تریشی بریتییە لە ئەخلاق و خوورەوشتی جوان و کردەوەی چاکە..

* هەروەها دەفەرموێت: (طَهِّروا هذهِ الاجسَاد طَهَّرَكمُ اللّٰهُ) [2]. واتە: جەستەتان پاك و خاوێن رابگرن با خوای گەورەش پاکتان بکاتەوە.

موسڵمان دەبێ رووخساری جوان بێت، خۆی لە بیر نەکات، جل و بەرگی جوان و پاك و خاوێن بێ، چونکە خەڵك چاو لەو دەکەن، بۆیە پێویستە پێشەنگ بێ، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی پاك و خاوێن بووە و فەرمانیشی داوە بە شوێنکەوتووانی کە پاك و خاوێن بن، بۆنی خۆش لە خۆیان بدەن، بەتایبەتی بۆ جەماعەتی رۆژی هەینی.

ئیسلام تەنها بەپاك و خاوێنی ئادەمیزاد خۆی وازی نەهێناوە، بەڵکو گرنگی بە پاك و خاوێنی کۆمەڵگەش داوە بە شێوەی گشتی، قەدەغەی کردووە لە ژێر سێبەری درەختی سەر رێگا و داری بەرداردا دەست بە ئاو گەیاندن، یان لەسەر رێگاو باندا کە خەڵکی هاتوچۆی پیادەکەن بە تایبەتی، هەروەها دەبێت گۆرەویەکانیان بشۆن بۆ ئەوەی بۆنەکەیان خەڵکی وەڕس و سەغڵەت نەکات، پیاز و کەوەر و سیر و ئەو شتانەی بۆنیان خەڵکی

---

(١) أخرجه مسلم في الطهارة: (١)، وأحمد في المسند: (١/ ٣٤٢).

(٢) رواه الطبراني وقال الألباني حسن لغيره في صحيح الترغيب والترهيب: (٥٩٩).

سەغڵەت دەكات نەیخۆن كاتێك ڕۆشتن بۆ مزگەوت، دەم و ددانیان بە دەرمان بشۆن، سیواك بكەن، قژیان دابهێنن و شانەی بكەن نەك هەرتەڵێكی رووبكاتە شوێنێك وەك شەیتان.

خوای گەورە پێی خۆشە شوێنەواری ناز و نیعمەتەكانی بە بەندەكەیەوە دیار بێت، لەبەر ئەوە دەبێ خۆتان برازێننەوە لەكاتی چوون بۆ مزگەوت.

* جابر (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی كردووە میز بكرێتە ناو ئاوی وەستاوەوە: (نَهَى أن يُبالَ فِي الماءِ الراكد)[1].

بێگومان زۆربەی نەخۆشییە گواستراوەكان ئەوانەی لە یەكێكەوە بۆ یەكێكی تر دەگوێزرێنەوە بەهۆی ئاوی پیسەوەیە وەك: كولێرا، گرانەتا، ئیفلیجی منداڵ، هەوكردنی جگەر، میكرۆبی ئەم نەخۆشییە ترسناكانە لە ناو ئاوی پیسدا گەشە دەكەن و دەمێننەوە، كەواتە قەدەغەكردنی لە پیس بوون واجبە لەبەر بەرژەوەندی خەڵك و بلاّو بوونەوەی نەخۆشییە پڕمەترسی و ترسناكەكان.

ئەو پاك و خاوێنییەی كە ئیسلام گرنگی پێداوە كردەوەیەكی چاكە، موسڵمان هەست بە بەختەوەری دەكات كاتێك فەرمانبەردار و گوێرایەڵی پەروەردگار و پێغەمبەرەكەیەتی، یەكسەر دڵی ئەوا بیستم و فەرمانبەردارم، كە ئەوەش هەرچی حەب و دەرمانی سەر زەوییە پێی راناگات..

## ٢- چوونە سەرئاو و خۆپاككردنەوە (الإِسْتِجْاء):

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُوا وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُطَّهِّرِينَ﴾ التوبة: ١٠٨. لەو مزگەوتەدا چەند كەسانێكی مەردی تێدایە كە زۆر حەز دەكەن خۆیان لە هەموو كردەوەیەكی خراپ دوور بخەنەوە و خۆیان پاك وخاوێن رابگرن خواش ئەو كەسانەی خۆش دەوێت كە خۆیان پاك رادەگرن.. جا چ پاك و خاوێنی جەستە بێ یان پاك و خاوێنی دڵ و دەروون.

(١) أخرجه مسلم: (٢٨١)، والنسائي: (١/٣٤).

* جابر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە ئەوە بوو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (ئەی کۆمەڵی ئەنصار خوای گەورە مەدحی ئێوەی کردووە لەسەر پاك و خاوێنیتان کامەیە پاك و خاوێنیەکەتان؟. وتیان: دەستنوێژ دەگرین بۆ نوێژ، کاتێك لەشمان گران بوو خۆمان دەشۆین، لە دوای دەست بە ئاو گەیاندن بە ئاو خۆمان پاك دەکەینەوە، فەرمووی: دەی هەر لەبەر ئەوەیە، بەردەوام بن لەسەر پاك و خاوێنی)[1].

خوای گەورە ئەم مرۆڤەی وا دروستکردووە هەر لە سەرەتاوە کە خۆی ڕزگار بکات لە هەرچی لە ناو میزڵدان و ڕیخۆڵەکانیدایە لە پیسایی و میز، جگە لەوانەش لە پاشماوەکانی جەستە خۆی خاڵی بکاتەوە و پاك ببێتەوە. تا وەك جەستەی هەمیشە پاك و تەندروست و چالاك بێت، توانای ئەنجامدانی کارەکانی هەبێت دوای ئەو خاڵی کردنەوەیە.

واجبە لەسەر موسڵمان ئەو شوێنانەی پاك بکاتەوە بە ئاو واتە پاش و پێشی خۆی، ئەویش بەدەستی چەپی و دوای هاتنە دەرەوەش دەبێ بە صابون پاك دەستی بشوات بۆ ئەوەی هێلکۆکەی ئەو مشەخۆرانە لە ژێر نینۆك و گرێ و لۆچەکانی پەنجەیدا کۆنەبنەوە و ببنە هۆی نەخۆشی کوشندە و ترسناك..

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (إِنَّ عَامَّةَ عَذَابِ القَبرِ مِنَ البَولِ، فَتَنَزَّهُوا مِنْهُ)[2]. واتە: زۆربەی سزای گۆڕ لەسەر خۆپاك نەکردنەوەیە لە پاش میزکردن، خۆتان پاك بکەنەوە و لەپاش دانیشتن لەسەر ئاو.

بێگومان ئەم کارەش سوودی زۆری هەیە بۆ خۆپاراستن لە نەخۆشی.

زانستی پزیشکی تازە دانی بەوەدا ناوە کە خۆ پاککردنەوەی دوای سەر ئاوکردن کۆئەندامی میز و میزەڕۆ دەپارێزێت لەو هەوکردنانەی کە لە ئەنجامی کەڵەکە بوونی میکرۆبەکان لەسەریەك پەیدا دەبن، هەروەها کۆمیش دەپارێزن لە خوێن تیزان و هەوکردن و دومەڵ، لە کاتی نەخۆشی دا بەتایبەتی ئەوانەی نەخۆشی شەکرەیان هەیە یان میزەکەیان ڕێژەی شەکری تێدا زۆرە، چونکە میزی نەخۆشەکە ڕێژەیەکی زۆر شەکری تێدایە، ئەگەر شوێنەواری میز مایەوە ئەو ئەندامە ئامادەیە بۆ توشبوون بە هەوکردن و کێم و زووخ،

---

(١) رواه احمد.

(٢) رواه عبد الحميد، والبزار، والحاكم وصححه الألباني في الإرواء: ١/٣١١.

گومانی تێدا نییه لەکاتی ئەنجامدانی کاری جووت بووندا دەگوێزرێتەوە بۆ هاوسەر و دەبێتە هۆی نەزۆکی تەواو.

لەبەر ئەوە ئیسلام بە دەستی چەپ خۆ پاکردنەوەی لە پیسی بە سوننەت داناوە، تاوەك دەستی ڕاست پاك بێ و تایبەت بێ بۆ نان خواردن، هەندێ کەس سەریان لەوە سوڕ دەمێنێ کە ئیسلام بۆ ئەوەندە گرنگی و بایەخی داوە بە خۆ پاککردنەوە، بەڵام ئەوانەی چاك لەم ئایینە تێگەیشتوون گەورەیی و شکۆی دەزانن سەریان سوڕنامێنێ.

چەسپاوە کە هەندێ جار بە بەرد خۆ پاککردنەوە لە دوای دانیشتنی سەر ئاو لە ئاویش باشترە بەتایبەتی بۆ لابردنی (چەوری و هێلکۆکەی کرمەکانی ناو پاشەڕۆی پیسایی) چونکە سابون لەو ڕۆژگار و سەردەمەدا ناو و باوی نەبوو، خەڵك بە بەرد خۆیان پاك دەکردەوە، لە پاشدا بە خۆڵ دەستی چەپیان لە پیسایییەکە پاك دەکردەوە پاشان بە ئاو دەیانشت.

لەسەروی هەموویەوە پێغەمبەی خوا ﷺ دەستی چەپی تایبەت کردووە بۆ خۆ پاککردنەوە و دەستی ڕاستیش بۆ خواردن و خواردنەوە، ئەمەش لەبەر ئەوەی هێلکۆکەی مشەخۆرەکان کە لەناو پیسایدان نەوەك لە ناو گرێکانی پەنجە و ژێر نینۆکەکاندا بمێننەوە سەرەڕای ئەوەش کە دەیشۆن.

بەڕاستی ئەم ئایینە خوای گەورە تەواوی کردووە و کامڵە بۆ هەموو چەرخ و سەردەمێك و هەتا هەتاییە بۆ بەشەریەت تا قیامەت، بەرنامەیەکە تەنها خێر و خۆشی بۆ بەندەکان دەوێت.

لە ساڵی (١٩٦٣) لە شاری (داندی) بەریتانیا بە شێوەیەکی بەربڵاو خەڵك تووشی گرانەتا هاتن توشی سەغڵەتییەکی یەکجار سەخت بوون، هەرچی توانایان هەبوو خستیانە کار بۆ وەستانی بەڵام دەستەوسان بوون، لە ئەنجامدا زاناکانیان گەیشتنە ئەو قەناعەتە کە لە ڕێگەی ڕاگەیاندنەکانەوە خەڵك ئاگادار بکەنەوە کەکلێنکس بەکار نەهێنن ڕاستەوخۆ لە پاش دانیشتنی سەرئاو بۆ خۆ پاککردنەوە، بەڵکو بە ئاو خۆیان پاك بکەنەوە، خەڵك هاتن بەدەم داواکەیانەوە ئیتر نەخۆشییەکە نەما بە تەواوی، دەبێ ئەو خەڵکە چییان بوتایە ئەگەر بیانزانیایە ئیسلام لە پێش هەزار و چوار سەد و ئەوەندە ساڵ لەمەو پێش وای فەرمووە!

که گرانەتا ناوی نەبوو لە ناویاندا، بەڵام خالقی گرانەتا و نەخۆشییەکانی تر فەرمانی دەکرد بە هەر شتێ ببێتە هۆی لەش ساغی و تەندروستییان ئەوانیش هەموویان دەیان وت: فەرمانبەردار و گوێڕایەڵین.

خوای گەورە دەفەرمۆێت:﴿ أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ ﴾ الملك: ١٤. واتە: ئەو خوایەی کە عالەمی لە نەبوونەوە هێناوەتە بوون، ئایا نازانێت چی لەناو دڵتاندایە و دەیشارنەوە و چیش ئاشکرا دەکەن لە کاتێکدا ئەو خوایە زانینی دەوری هەموو شتێکی داوە، هەرچەندە ئەو شتانە زۆر ورد و شاراوە و پەنهانیش بن.

## ٣- خۆشتن:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَقْرَبُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعْلَمُوا۟ مَا تَقُولُونَ وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِى سَبِيلٍ حَتَّىٰ تَغْتَسِلُوا۟ ﴾ النساء: ٤٣. واتە: ئەی ئەوکەسانەی ئیمانتان هێناوە لەکاتی سەرخۆشیدا نزیکی نوێژ مەکەونەوە، تاسەر خۆشییەکاتان دەڕوات بۆ ئەوەی بزانن چی دەڵێن.. ئەگەر لە شیشتان گران بوو نوێژ مەکەن مەگەر ڕێبوار بن لە سەفەردا، هەتا خۆتان دەشۆن. بێگومان ئەوانەی ڕیبوارن یان لە سەفەردان پێویستە لە سەریان تەیەموم بکەن.

خوای گەورە فەرمانی کردووە بە ئەیوب ﷺ: ﴿ ٱرْكُضْ بِرِجْلِكَ ۖ هَٰذَا مُغْتَسَلٌۢ بَارِدٌ وَشَرَابٌ ﴾ ص: ٤٢.

واتە: ئێمەش فەرمانمان پێکرد کە قاچت لە زەوی بدە.. جا کە قاچی لە زەویدا ئاوێکی ڕوونی لێ هەڵقولا و، پێمان ڕاگەیاند کە ئەمە ئاوێکی سارد و سازگارە بۆ خۆشتن و بۆ خواردنەوەش، جا خۆتی پێ بشۆ و لێشی بخۆرەوە.

خۆشتن بایەخێکی گەورەی هەیە، چارەسەری زۆر لە نەخۆشییەکان دەکات، بەڵام هیچ گەلێك نەیتوانیوە وەك ئیسلام بەرنامەیەکی گونجاو و ڕێك و پێکی بۆ دابنێ، خوای گەورە و کاربەجێ هەر پێش ئەوەی موسڵمانان شایەتومان بهێنن فەرمانیان پێدەکات خۆیان بشۆن، هەروەها فەرمانی پێکردوون لە پاش تەواو بوونی جووت بوون خۆیان بشۆن، واجبە لەسەر ئافرەتان لەدوای حەیز و نیفاس خۆیان بشۆن بۆ ئەوەی پاك ببنەوە لەو میکرۆبانەی

لە ڕێی ڕەحمەوە دەردەدرێن و تێکەڵی لەشیان بووە لەو ماوەیەدا.

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ ﴾البقرة: ٢٢٢. واتە: مەچنە لایان تا پاك دەبنەوە و خۆیان دەشۆن.

پێویستە لە سەر موسڵمانان بەیانی هەموو ڕۆژێکی هەینی و هەردوو چەژنەکان خۆیان پاك بشۆن بۆ ئەوەی پاك و خاوێن بن لەو قەڵە باڵغیەدا نەبنە زەحمەت بۆ موسڵمانان.

زانستی پزیشکی تازە ئامۆژگاری ئەوەیە لەپاش کاری جووت بوون ئادەمیزاد دەبێ خۆی بشوات لەبەر ئەم هۆیانە:

١٠- سوڕی خوێن چالاك دەبێ لە پیاوان و ئافرەتاندا، چونکە کاری جووت بوون دەبێتە هۆی سستی و لاوازییەکی زۆر لە دەمارەکانی مێشك لە پاش ئەو خۆشی و چێژ وەرگرتنە.

٢- خۆشتن یاریدەدەرێکە بۆ چوست و چالاکی جەستە و بەرز بوونەوەی ڕوحی مەعنەویات بەتایبەتی لە پاش ئەنجامدانی کاری جووت بوون، کە دەبێتە هۆی لاوازی دەروونی و ئارەزووی خەوتن و غەمۆکی لە هەندێ کەسدا.

٣- پێست لەکاتی دەرهاویشتنی تۆودا ئارەقێکی زۆر دەردەدات لە کونی مووەکانەوە، لەوانەیە جەستە هەڵیمژێتەوە و ببێتە هۆی زەرەر و زیان بۆی، خۆشتن دەبێتە هۆی پاك بوونەوەی پێست و ئەو کونانەش.

٤- بیرکردنەوە لە خۆشتن لە دوای جووت بوون پیاو وا لێدەکات کە کەمتر داوای بکات، بەوەش پارێزگاری لە توانای جنسی خۆی دەکات بۆ تەمەنێکی دوور و درێژ.

سوننەتە لە نێوان دوو جار ئەنجامدانی جووت بووندا خۆ بشۆردرێت، حیکمەت لەوەدا ئەوەیە حەمام کردن توانای جەستە و عەقڵ تازە دەکاتەوە، هەروەها پاك و خاوێنی و درەوشانەوەیە، ئادەمیزاد دەبات بەرەو پلەی بەرزی حاڵەتی دەروونی و جەستەیی..

ئەبوسەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (إذا أرتى أحَدُكم أهْلَهُ ثُمَّ أرادَ أن يَعُودَ فَلْيَتوضَأ)[1]. واتە: ئەگەر کەسێکتان چووە لای خێزانی، ئینجا ویستی دووبارەی بکاتەوە با دەست نوێژ بگرێت.

خۆشتن بە ئاوی گەرم دەبێتە هۆی کردنەوەی هەموو ئەو کونانەی لەسەر جەستەدان، ئەوکاتە بە شێوەیەکی سروشتی خانەکانی هەوا وەردەگرن، وەك زانراوە خانەکانی لەش وەك هەموو زیندەوەرێکی تر هەناسە وەردەگرن، خۆشتن بە ئاوی گەرم ئەو خانانەی کە لەناوچوون یاخود زیانیان پێ گەیشتووە تازەیان دەکاتەوە بەوەش جەستە چوست و چالاك دەبێت، مێشك هێور دەبێتەوە، ئەگەر لە شەودا بوو ئەوا دەبێتە هۆی خەوێکی خۆش، هەروەها خۆشتن بە ئاوی گەرم دەبێتە هۆی کەم ڕوودانی حاڵەتی سك چوون، چونکە یارمەتی هەرس کردنی خۆراك دەدات.

خۆشتن بە ئاوی سارد دەبێتە هۆی چالاکی هەموو خانەکانی جەستە و دەمارەکان و سوڕی خوێن، دوای ئەوەی دەمارەکان خاو دەبنەوە..

خۆشتن بە ئاوی سارد دەبێتە هۆی گونجاندن و نەرم بوونیان بە شێوەیەکی پێویست، کە ئەو حاڵەتەش دڵ و پەستانی خوێن دەپارێزێ لە زۆر نەخۆشی ترسناك، هەروەها یارمەتی هەناسەدانیش دەدات بە شێوەکی چالاکانە کاری خۆی بکات، لێدانی دڵ و پەستانی خوێن هاوسەنگ دەکات، کەڵك و سوودێکی چاکی هەیە بۆ ئەو کەسانەی گەدەیان ساغ و سەلامەتە.

لە پاش کاری جووت بوون و نان خواردن نابێت ڕاستەوخۆ بە ئاوی سارد خۆ بشۆردرێت چونکە زیان دەگەیەنێ بە جەستە.

خۆشتن بە شێلانەوە: ئەمەش باشترین جۆری خۆشتنە و یارمەتی دەرە بۆ چالاکی جەستە بە شێوەیەکی سەیر، خەوێکی خۆش و تەندروستی لە دواوەیە ئەگەر یەکێك بیەوێت بخەوێت، چونکە هەموو هەستیارەکان هۆشیار دەکاتەوە و سوڕی خوێن چالاك دەکات. باشتر وایە زەیتی زەیتون بەکار بهێنرێت لەگەڵ شێلاندا لە پاش وەرزش و مەشق کردن بەتایبەتی.

---

(١) مختصر صحيح المسلم: (١٦٢).

٤- دەستنوێژ گرتن: دەستنوێژ چەکی موسوڵمانانە، هۆی گوناه شۆردنەوەیە، پێشەکییەکە بۆ ئەنجامدانی گەورەترین عیبادەت کە نوێژە، بە تەنها شۆردنی چەند ئەندامێك نییە و بەس لە رۆژێکدا چەند جارێك، بەڵکو کاریگەری دەروونی هەیە و بەرزێتی روحە کە موسڵمان هەستی پێدەکات..

دەستنوێژ زۆر لەوە گەورەترە بە چەند وشەیەك تەعبیری لێ بکرێت، بەتایبەتی ئەگەر بەدڵنیایی و بە باوەڕەوە بگیرێت کاریگەری باشی دەبێت لەسەر ژیانی موسڵمان، هەمیشە و دایم هۆشیاری دەکاتەوە و سیمای جوان دەکات..

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (وَلَنْ يُحَافِظَ على الوُضُوءَ إلاّ مُؤمِنٌ..)[1]. واتە : تەنها ئیماندار پارێزگاری لە دەست نوێژ دەکات..

شتنی ئەو ئەندامانەی کە لە دەست نوێژدا دەشۆردرێن چونکە بە دەرەوەن زیاتر ئامادەن بۆ پیس بوون بە تەپ و تۆزو میکرۆب، ئەو میکرۆبانەش زیاتر لە رێگەی پێستەوە هێرش دەبەن بۆ ناو جەستە، بە پاککردنەوە و شتنی ئەو ئەندامانە لە رۆژێکدا چەندجار دەبێتە هۆی پاراستنی جەستەو نەمانی ئەو میکرۆبانە، بەتایبەتی ئەگەر دەست نوێژەکە بە جوانی و رێك پێکی ئەنجام بدرێت.

ئاو لەدەم وەردان: زانستی تازە دەری خستووە دەم و گەروو دەپارێزێت لە هەوکردن و پوکیش دەپارێزێ لەکێم و زووخ، هەروەها ددانەکانیش دەپارێزی لە پاش ماوەی ئەو خواردنانەی کە لەنێوان ددانەکاندا دەمێنێتەوە، چونکە بە مانەوەی میکرۆب لەسەریان دەژی و گەشە دەکات ئەو کاتە دەبێتە هۆی نەخۆشی ددانەکان.

هەروەها ئاو لە دەم وەردان بایەخێکی زۆری هەیە لەوانە بەهێزکردنی ماسولکەکانی شەویلگە و دەم و چاوە، کە ئەویش بۆ خۆی وەرزشێکی گرنگە، ئەو وەرزشەش سوودی هەیە و یارمەتی هێور بوونەوەی دەروون دەدات ئەگەر ئەو کەسە لەکاتی ئاو لە دەم وەرداندا ماسولکەکانی دەمی بجوڵێنێ.

ئاو لە لوت وەردان: لێکۆڵینەوەی زانستی دەری خستووە کە هەندێ لە پزیشکەکانی زانکۆی ئەسکەندەریە ئەنجامیان داوە دەڵێن: ئەوانەی بە بەردەوامی دەستنوێژ دەگرن لوتیان

---

(١) (صحيح الترغيب والترهيب) (١٩٧)، رواه أحمد.

پاك و خاوێنە لە میکرۆبەکان و گەراکانیان و تەپ و تۆز، وەك زانراوە ئەو بۆشاییەی ناو لوت شوێنی کۆ بوونەوەی زۆرێك لەو میکرۆبانە و گەراکانیانە، گومانی تێدا نییە بە بەردەوامی ئاو لە لوت وەردان و شتنی دەبێتە هۆی پاکبوونەوە لێیان، ئەوکاتەش کاریگەری هەیە بۆ سەر تەندروستی جەستە هەمووی، ئەم کارەش رێگری دەکات لەگواستنەوەی میکرۆبەکان بۆ ناو ئەندامەکانی تری جەستە.

شتنی رووخسار و هەردوو دەست: شتنی دەم و چاو و هەردوو دەست تا ئانیشکەکان بایەخێکی زۆری هەیە بۆ لە ناوبردنی تەپ و تۆز و میکرۆب لەگەڵ ئەوەشدا پاککردنەوەیانە لەو ئارەقەی وشك بۆتەوە لەسەر پێست، پێستیش پاك دەکاتەوە لەو چەورییەی کە چەورییە رژێنەکانی پێست دەری دەدەن، کە ئەوەش بۆ خۆی شوێنێکی گونجاوە بۆ گەشەکردنی میکرۆبەکان.

شتنی قاچەکان: جوان شتنی قاچەکان و شێلانیان لەکاتی دەست نوێژدا دەبێتە هۆی هەستکردن بە هێمنی و ئارامی، چونکە ئەو پەنجانە کاردانەوەیان هەیە بۆسەر جەستە بەگشتی بەو شێلان و شتنە بە رێك و پێکی.

هەندێ لە نهێنیەکانی تری دەستنوێژ: چەسپاوە بە لێکۆڵینەوەی زانستی هۆی پاراستنی جەستەیە لە تیشکی خۆر بە تایبەتی تیشکی سەرو بنەوشەیی کە دەبێتە هۆی روودانی شێرپەنجەی پێست، لەبەر تەری سەر پێست. شتنی قاچەکان و دەستەکان و مەچەك کە دوورن لەدڵەوە بە شتن و شێلان سوڕی خوێن بەهێز و چالاك دەکەن، هەروەها دەبنە هۆی چالاکی جەستە و ژیانەوەی. بەهۆی دەستەکانەوە هەرچی میکرۆبە دەگوێزرێتەوە بۆ ناو دەم و لوت ئەگەر نەشۆردرێن بە باشی.

* پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژەی بۆ کردووە بەم فەرموودەیە: (إذا استَيقَظَ أَحَدُكُم مِن نَومِهِ فلا يُدخِلُ يَدَهُ في الإناءِ حَتّى يَغسِلها ثلاثاً، فَإِنَّ احدَكُم لايَدْري أَيْنَ باتَت يَدُهُ)[1].

واتە: ئەگەر یەکێتان لەخەو هەستا بادەستی نەخاتە ناو ئەو دەفرەی ئاوی تێدایە و بەکاری دەهێنێ، تاسێ جار دەستی نەشوات، چونکە نازانێ دەستی بەرکوێ کەوتووە کاتێ خەوتووە.

---

(١) متفق عليه، البخاري(١٥٤)، ومسلم: (٦٤٤).

دكتور ئەحمەد شەوقی کە یەکێکە لە پزیشکەکانی نەخۆشی دڵ و هەناوی دەڵێ: زاناکان گەیشتونەتە ئەو قەناعەتەی کە دابەزینی تیشکی رووناکی بۆ سەر ئاو لەکاتی دەستنوێژ گرتن دەبێتە هۆی نەمان و دەرچوونی ئایۆنی سالب و کەم کردنەوەی ئایۆنی موجەب، کە ئەوەش دەبێتە هۆی خاوکردنەوەی دەمارەکان و ماسولکەکان، جەستەش رزگار دەکات لە بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن و ئازاری ماسولکەکان و پەشێوی و خەوزڕان.

یەکێك لە پزیشکە ئەمریکییەکان دووپاتی کردووەتەوە و دەڵێ: شتنی دەستەکان بە ئاو (مەبەستی لە دەست نوێژە) چاکترین هۆکار و وەسیلەن بۆ خاوکردنەوە و نەهێشتنی گرژی و ئاڵۆزی!.[١]

## نەخۆشییە ترسناکەکان:

لە سەرژمێرییە نوێ و ترسناکەکانی یەکێك لە رێکخراوە زانستییەکانی بواری تەندروستی لەسەر ئاستی جیهان هاتووە کە ئەوەی پێغەمبەر هێناویەتی تەنها وەحییە و هیچی تر، چونکە بەڕاستی ئەو نەخۆشییە پیس و ترسناکانە تەنها بەهۆی پیسی دەستەکان و ئاو و خواردنەوە دەبنە هۆی توشبوونی نەخۆشییەکانی کۆئەندامی هەرس و گەورەترین زیانی پێ دەگەیەنن:

لەسەر ئاستی جیهان ساڵانە سێ ملیۆن کەس دەمرن بە هۆی نەخۆشییەکانی وەك: کولێرا، گرانەتا، جگەری درم،کە لە رێگەی هەواوە بڵاو دەبنەوە، هەروەها نەخۆشی سك چوونی خوێناوی و، نەخۆشی ریخۆڵەکان..

سێ ملیۆن کەس بەهۆی شوێن نەکەوتنی سوننەتەوە دەمرن ساڵانە، نیوەیان منداڵن لەبەر گوێنەدانیان بەدەست شتن لەسەر ئاو پاش هاتنە دەرەوە، هەروەها لەپاش و پێشی نان خواردن.

دەست و دەم شتن سوننەتە لە پێش نان خواردندا، بایەخ دان بەخۆ پاککردنەوە لەسەر ئاو بەدەستی چەپ و لەپاش هاتنە دەرەوەش بە سابون.

---

(١) مجلة الاصلاح عدد: (٢٩٦)، من ندوات جمعيه الاعجاز العمل القرآن.

* ئەبو قەتادە لە باوکییەوە گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (إذا بَال أَحَدُ كُم فَلايَمَسَّ ذكَرَهُ بيَمينه، وَ إذا دَخَل الخلاءَ فَلا يَتَمَسَّح بيمينه، وَ إذا شَرِبَ فَلاَ يتنفَّسْ في الإناء)[1]. واتە: ئەگەر یەکێ لە ئێوە میزی کرد با بە دەستی راستی چووکی نەگرێت، ئەگەر چووە سەر ئاو بۆ تارەت گرتن ئەوە با بە دەستی راستی خۆی پاك نەکاتەوە، لەکاتی ئاو خواردنەوەدا هەناسە مەدەن.. چونکە هەناسەدان دەبێتە هۆی تەنینەوەی نەخۆشی.

پێویستە میوە و سەوزە لە پێش خواردنیان پاك بشۆدرێنەوە، فو نەکرێت لەو دەفرەی شتی تیا دەخورێتەوە بۆ ئەوەی پیس نەبێ... فەرمانمان پێکراوە کە نینۆك بکەین و جوان گرێی پەنجەکان و سەری پەنجەکان بشۆین، بەدەستی راست خۆمان پاك نەکەینەوە لە سەرئاو، چونکە بە دەستی راست خواردن دەخۆین و، تەوقە دەکەین لەگەڵ خەڵك، ئەگەر بە دەستی راست خۆپاك بکرێتەوە دەبێتە هۆی گواستنەوەی میکرۆب بۆیان، ئەمەش لە ئامۆژگاری و رێنومایییەکانی پێغەمبەری خودان ﷺ بۆ موسڵمانان: (لاتَبُل فِي المَاءِ الدَّائِم الَّذي لايَجْري ثُمَّ تَغْتَسِلُ مِنْهُ)[2]. واتە: میز مەکەنە ئاوی هەمیشە راوەستاو و پاشان خۆشتانی تێدا بشۆن.

* ئیبن عەبباس (رەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: (إتَّقوا مَلاَعِنَ الثَلاثَ: أنْ يَقْعُدَ اَحَدُكُمْ في ظِلٍ يَسْتَظَلُّ فِيهِ، أوفي طَرِيقٍ أو في نَقَعِ ماءٍ)[3]. واتە: خۆتان بپارێزن لەو سێ شتەی نەفرەتیان لێ کراوە: پیسایی کردنە سێبەری ئەو درەختانەی خەڵکی تیایدا دەحەوێنەوە، یان پیسایی کردنە سەر رێگای سەرەکی خەڵك، یاخود پیسایی کردنە ناو حەوز و بیری ئاو و ئەو دەفرەی ئاوی تێدایە کە خەڵك ئاوی لێ دەبەن بۆ بەکارهێنان.

ئەمانەش رێنومایی پێغەمبەری خودان ﷺ پێش ئەوەی زانستی میکرۆب زانیاری نەخۆشییە درمەکان بوونی هەبێت.

---

(١) أخرجه البخاري في الوضوء: (١٥٤)، ومسلم في الطهارة: (٦٣).

(٢) متفق عليه.

(٣) أبو داود: (٢٦) واحمد: (١/ ٢٩٩) وهو حديث حسن.

ئەمەش کە دەڵێ: ساڵانە سێ ملیۆن خەڵك دەبنە قوربانی نەخۆشی راپۆرتی ڕێکخراوی تەندروستی جیهانییە، هی زانا ئیسلامییەکان نییە و بە فەرمانی ئایینی ئیسلام ئەوەیان نەکردووە.

سێ ملیۆن کەس بەهۆی خۆپاك نەکردنەوە و دەست نەشتن بە ئاو و سابون لە دوای سەرئاوکردن و پێش نان خواردن..

ئەم ئاینە پیرۆزە بۆ ڕۆشن کردنەوەی ڕێگای ڕاست هاتووە، ئەم قورئانە هیدایەت بەخشە بۆ ئەوکەسانەی شوێنی دەکەون هەنگاو بەهەنگاو لەسەری دەڕۆن، خوای گەورەش ئەوانەی خۆش دەوێ کە پەشیمان دەبنەوە لە تاوانەکانیان، ئەوانەشی خۆش دەوێ کە خۆیان و جل و بەرگ و دڵ و دەروونیان پاك و خاوێن رادەگرن[1].

## نوێژ شیفایە

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱسْتَعِينُوا۟ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ ۚ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلَّا عَلَى ٱلْخَـٰشِعِينَ﴾ البقرة: ٤٥. واتە: پەنا ببەنە بەر خۆڕاگری و نوێژکردن، بەڕاستی نوێژ ئەرکێکی گەورە و گرانە، بەڵام بۆ ئەوانەی کە لە خوا دەترسن و ملکەچانە نوێژ دەکەن بە خۆشەویستی و سۆزەوە خوا پەرستی ئەنجام دەدەن، نەك هەر قورس نییە بگرە زۆر ئاسانە و مایەی ئارامی دڵ و دەروونیانە.

چەسپاوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ هەرکاتێك دڵگرانی و غەم و پەژارە رووی تێ بکردایە هانای بۆلای نوێژ دەبرد: (أَنَّهُ إِذا حَزِنَ مِن أَمْرٍ فَزَعَ إلى الصَّلاة)[2].

نوێژ گاریکەری گەورەی هەیە بۆ رەواندنەوەی غەم و پەژارە و نائارامی دەروون، بۆ دڵ ئارامی و بەهێزکردنی، هەروەها بۆ سنگ فراوانی و سینەپاکی بەو پەیوەندییەی کە دەیکات بە پەروەردگارەوە، کە چاکترین کردەوەیە.

---

(١) الاعجاز العلمي: دكتر نابلسي.

(٢) إسناده حسن رواه أحمد، وأبوداود.

* پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (وَاعْلَمُوا أَنَّ خَيرَ أَعْمَالِكُم الصَّلاةُ)[1]. واتە: بزانن بەڕاستی چاکترین و باشترین کردەوەتان نوێژە.

نوێژ شیفایە بۆ دەروون، چارەسەرێکی کاریگەرە بۆ جەستەی ئادەمیزاد..

* ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەرمبەری خوا ﷺ منی بینی خەوتبوم هاوارم دەکرد لەتاو ئازاری سکم، پێی فەرموم: (ئەی ئەبا هورەیرە! سکت ئازارت دەدات؟) وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! فەرمووی: (قُم فَصلِّ، فَإنَّ في الصَّلاةِ شِفاءٌ)[2]. واتە: هەستە نوێژ بکە، چونکە بەڕاستی نوێژ کردن شیفایە.

لێکۆڵینەوەکانی زانستی سەردەم دەریان خستووە کاتەکانی نوێژ کردن هەماهەنگن بە تەواوی لەگەڵ کاتەکانی چالاکی فیسیۆلۆژی جەستەدا، هەر دەڵێی فەرمانڕەوایەکی کارامەیە بۆ ڕێکخستنی کارەکانی هەموو جەستە بەگشتی.

(کورتیزۆن) هۆرمۆنێکی چالاکە لە جەستەی مرۆڤدا لەگەڵ کاتی نوێژی بەیانیدا دەست دەکات بە زۆر بوون، کە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ بەرز بوونەوەی فشاری خوێن بەگوێرەی پێویست بەوەش مرۆڤ هەست بە چالاکییەکی گەورە دەکات لە دوای نوێژی بەیانیەوە لە نێوان سەعات شەش بۆ حەوت، ئەوکاتەش وەختی هەوڵ و تەقەلا و قوڵ هەڵکردنە بۆ پەیدا کردن و بەدەست هێنانی بژێوی ژیان و کارکردن.

* پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژەی بۆ کردووە بەم فەرموودەیە: (اللَّهُمَّ بَارِكْ لأُمَّتِي فِي بكورِها)[3]. واتە: خودایە! فەڕ و بەرەکەت بخە ئیش و کاری ئوممەتم سەر لەبەیانی.

کاتی نوێژی بەیانی گازی ئۆزۆن دەگاتە بەرزترین ڕادەی لە کەش و هەوادا، ئەوەش کاریگەری چالاکی هەیە بۆ کۆئەندامی مێشك و دەمارەکان، زیهن و ماسولکەکان چوست و چالاك دەکات، بە پێچەوانەشەوە لەکاتی چێشتەنگاودا کە خۆر بەرزبوەوە دەردانی کۆریزۆن دەگاتە کەمترین ڕادە و، مرۆڤ هەست دەکات بە ماندو بوون و هیلاکی ئیتر پێویستی بە حەوانەوە دەبێت لە دوای نزیکەی حەوت سەعاتێك پاش نوێژی بەیانی یان زوو

---

(١) صحيح، سنن إبن ماجة: ١/١٠١، ٢٧٧، سلسلة الصحيحة: ١/٢٢٣. وأحمد والحاكم.

(٢) رواه ابن ماجه: (٣٤٥٨).

(٣) أخرجه أبو داود: (٢٦٠٦) و الترمذي: (١٢١٢) و ابن ماجه: (٢٦٣٦).

لەخەو هەستان، ئیتر کاتی نوێژی نیوەڕۆ دێتە پێشەوە دڵ و جەستەی ماندوو هەست بە حەوانەوە و ئارامی و هێور بوونەوە دەکەن بە نوێژکردن.

لە پێش یان دوای نوێژی نیوەڕۆش موسڵمان هەوڵ دەدات سەعاتێك بخەوێ بۆ ئەوەی بحەوێتەوە و چالاکی تازە بێتەوە، ئەوەش بۆ هەستانی شەو یارمەتی دەرێکی باشە.[1]

بە شێوەیەکی زانستیانە چەسپاوە،بە شێوەیەکی گشتی لە کاتی ئەو نوێژە داجەستەی مرۆڤ بە کاتێکی زۆر سەختدا تێپەڕ دەبێت، دەردانی ماددەی کیمیایی سڕکەر دەگاتە بەرزترین پلە لە جەستەدا و هانی دەدات بۆ خەوتن، پاشان نوێژی عەسریش دێتە پێشەوە و چالاکی جەستە دەگەڕێنێتەوە دۆخی خۆی.. جارێکی تر (ئەدرینالین) لە خوێندا دەگاتە بەرزترین پلەی خۆی و، دەبێتە هۆی چالاکی هەست پێکراوی ئەرکەکانی جەستە بەتایبەتی چالاکی دڵ، کەواتە نوێژی عەسر دەورێکی ترسناکی هەیە لە تەیار کردن و ئامادەکردنی دڵ و جەستە بە شێوەیەکی تایبەتی بۆ پێشوازی ئەو چالاکییە لە پڕەدا، بەزۆری دەبێتە هۆی ماندوبوونێکی زۆر ترسناك بۆ ئەوانەی نەخۆشی دڵیان هەیە بەهۆی ئەو ئاڵوگۆڕییەی کە لە پڕ ڕوودەدات، لەمەشەوە ئەو نهێنییە سەیرەمان بۆ ڕۆشن دەبێتەوە کە قورئانی پیرۆز ئامۆژگاریمان دەکات بە پارێزگاری کردن لە نوێژی عەسر.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿حَـٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ وَقُومُواْ لِلَّهِ قَـٰنِتِينَ﴾ البقرة: ٢٣٨. واتە: ئاگاداری نوێژەکانتان بکەن، بە تایبەتی نوێژی ناوەراست، لە نوێژدا بوەستن بۆ خوا بە گەردن کەچی.

زانایانی تەفسیر یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە (الصَّلاة الوسطى) نوێژی عەسرە.

زۆر دەردانی هۆرمۆنی (ئەدرینالین) لەوکاتەدا ئەو نهێنییەمان بۆ روون دەکاتەوە، ئەنجامدانی نوێژی عەسر و سوننەتەکانی دڵ چالاك دەکەنەوە هێدی هێدی.

بە تێپەڕبوونی کات وردە وردە نوێژی مەغریب دێتە پێشەوە دەردانی هۆرمۆنی (کۆرتیزۆن) کەم دەبێتەوە و چالاکی جەستەش روو لەکەم و کوڕی دەکات، لەوکاتەدا رووناکی دەگۆڕێ بە تاریکی ئەمەش بە تەواوەتی پێچەوانەی نوێژی بەیانیە، ماددەی

---

(١) كتاب الاستشفاء بالصَّلاة للدكتور زهير رابح.

(الميلاتونين) بەزۆری دەردەدرێت لە جەستەدا و هانی دەدات بەرەو خەوتن و کەم توانایی بڕوات، جەستە روو لە تەمەڵی دەکات، ئەوکاتە نوێژی عیشاش دێتە پێشەوە کە ئیتر ئەوە دواهەمین نوێژی ئەو رۆژەیە جەستە لە چالاکییەوە دەبات بەرەو لای خەوتن، تاریکی زیاتر دادێ و ماددەی (میلاتونین) بەرەو زیاد بوون دەڕوات بۆیە موسوڵمانان حەز دەکەن درەنگ نوێژی عیشا ئەنجام بدەن لەبەرئەوەی یەکسەر لە دوای نوێژی عیشا بخەون.

* مەعازی کوڕی جەبەل (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی عیشای دواخست خەڵکی وایان گومان برد ئیتر نوێژ دەکات و ناچێتە دەرەوە لە مزگەوت، بۆیە فەرمووی: (نوێژی عیشا دوابخەن بۆ ئەم کاتە چونکە بەڕاستی ئێوە چاکترن لە ئومەتانی پێش خۆتان هیچ کام لە ئومەتەکانی پێش ئێوە نوێژیان نەکردووە لەم کاتەدا)[1].

لە بیرمان نەچێت دەردانی مادەی (میلاتونین) بە رێك و پێکی پەیوەندی توند و تۆڵی هەیە لەگەڵ پێگەیشتنی عەقڵ و جنسی مرۆڤدا، بەو رێك و پێکییەش جەستە شوێن کەوتەی سیستەم و بەرنامەیەکی دامەزراو دەبێت، ئەمەش دەری دەخات کردنی نوێژەکان لەکاتی خویاندا هەماهەنگن لەگەڵ چالاکییە فیسۆلۆژیەکانی رۆژانەدا، دەبنە هۆی ئەوەی ئادەمیزاد بتوانێ ئەرکەکانی بە ئەوپەڕی لێ هاتوویەوە بە ئەنجام بگەیەنێ.

## سوودەکانی شەونوێژ

١- شەونوێژ دەبێتە هۆی کەم دەردانی هۆرمۆنی (AcTH) کە ئەویش دەبێتە هۆی پاراستنی زیادبوونی کتوپڕی شەکرە لە خوێندا، کە مەترسیدارە بۆ ئەوانەی نەخۆشی شەکرەیان هەیە.

٢- زیادبوونی لەپڕی فشاری خوێن کەمدەکاتەوە و مرۆڤ دەپارێزێت لە سەکتەی دەماخ و جەڵتەی دڵ.

٣- دەبێتە هۆی کەم بوونەوەی مەترسی خوێن مەین لە دەمارەکانی شەبەکەی چاو، کە ئەویش لە ئەنجامی لەسەرخۆ هات و چۆکردنی خوێنەوە روودەدات لەکاتی خەوتندا، چونکە مرۆڤی خەوتو لەو ماوەیەدا شلەمەنی ناخوات.

---

(١) صحيح سنن أبو داود: (٥٢٦٥) (٣٦٧/٤)، وأحمد في المسنده.

٤- دەبێتە هۆی چاك بوونی حاڵەتی هەوكردنی جومگە جیاوازەكان جا هەوكردنی ڕۆماتیزمە بێ یان جگە لە ڕۆماتیزم، لە ئەنجامی شێلانی شوێنەكانی دەستنوێژ و ئەو جوڵانەی كە لە شەونوێژدا دەكرێ.

٥- دەبێتە هۆی كەمبوونەوەی چەوری كەڵەكەبوو لەناو خوێندا بەتایبەتی لەدوای ئەو ژەمانەی كە چەورییان زۆر تێدایە، كە ئەوەش دەبێتە هۆی زیاد بوونی توشبوون بە نەخۆشی خوێنبەرەكانی دڵ و خوێنبەری تاجی.

٦- دەورێكی باشی هەیە بۆ بیروهۆش تیژی بەهۆی ئەو قورئان خوێندنەی لەو شەوە كشوماتەدا دەخوێنرێت لەگەڵ زیكر و پاڕانەوەكان.

٧- هۆی كەمبوونەوەی مەترسی زوو پیری پێوە دیاربوون و نەخۆشییەكانیەتی.

٨- دەبێتە هۆی كەمبوونەوەی نەخۆشی (طَنين الأُذن)و زرنگانەوەی گوێچكەكان، هەروەها كەمكردنەوەی حاڵەتی غەمۆكی و دڵەڕاوكێ..

٩- پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: شەو نوێژ بكەن و بەردەوام بن لەسەری، چونكە ئاكار و ڕەوشتی پیاوچاكانی پێش ئێوە بووە، نزیك بوونەوەیە لە پەروەردگارتان، بەرهەڵستیكەری تاوانە و هۆی كەفارەتی گوناهەكانتانە[1].

## نوێژ خۆپاراستنە لە نەخۆشی دەوالی :

نەخۆشی دەوالی قاچەكان: بریتی‌یە لە خراپی و جیاوازی لە دەمارەكانی هەردوو قاچدا، دەمارەكانی ئەستور دەبن و لەنگی پێوە دەردەكەوێ و پڕ دەبن لە خوێنی ڕەنگ گۆڕاو بە درێژایی بەشی خوارەوەی هەردوو قاچ.

نەخۆشیەكە هەندێ لە خەڵك توش دەبن لە بەینی لە سەدا دە كەس بۆ بیست كەس لە هەموو دانیشتوانی سەرزەویدا.

لێكۆڵینەوەی زانستی تازە سەلماندوویەتی پەیوەندی چەسپاو هەیە لە نێوان نوێژكردن و خۆپاراستن لە نەخۆشی دەوالی قاچەكان.

---

(١) الترمذي، وابن خزيمة وحسنه لغيره الألباني في صحيح الترغيب والترهيب: ٦٢٤.

دکتۆر توفیق عەلوان مامۆستای کۆلیژی پزیشکی لە ئەسکەندەریە دەڵێ: بە سەرنج دانێکی زۆر ورد لە هەستان و دانیشتن لە نوێژدا دەرکەوتووە و جیادەکرێنەوە بەوەی ئەو تێکشان و گونجاندن و یارمەتی دانەی لە نێوان رکوع و سەجدە و دانیشتنی نێوان سەجدەکاندا هەیە چەندە سەر سوڕهێنەرن، بە پێوەری زانستی ورد دەرکەوتووە ئەو فشارەی لەسەر دیواری دەمارەکانی پاژنەی پێیە لە کاتی رکوعدا دەگاتە نیوەی رێکی، لەکاتی سەجدەدا دەرکەوتوە فشاری ناوەند زۆر لاواز دەبێ، بە شێوەیەکی سروشتی ئەو دابەزینە دەبێتە هۆی حەوانەوەی تەواو بۆ ئەو دەمارانە و فریایان دەکەوێ لەو فشارە زۆرەی کە لە ماوەی وەستان بە پێوە کەوتبوە سەریان، لە سەجدەشدا سوڕی خوێن بەپێی هێزی ڕاکێشانی زەوی بە تەواوی بە ئاراستەی ئەو هێزە کارەکانی جێبەجێ دەکات، ئەو خوێنەی لە ژێر پێدایە بە ئاسانی سەردەکەوێتەوە بۆ ناو دڵ و لە سەرەوە بۆ خوار هاتوچۆ دەکات، بەو کردارەش فشاری دەمارەکان کەم دەکاتەوە لەسەر رووکاری دەرەوەی قاچەکان لە (١٠٠ - ١٢٠ سم/ ئاو) لە کاتی راوەستان لە نوێژدا بۆ (١/٣٣ سم / ئاو) لە کاتی سەجدەدا، بەوەش روودانی نەخۆش دەوالی لە مرۆڤدا کەم دەکاتەوە.

# نوێژ چارەسەری نەخۆشییەکانە

نوێژ کردن بە خشوعەوە یارمەتی دەرێکی باشە بۆ هێور کردنەوەی دەروون و نەمانی گرژی و ئاڵۆزییەکانی، لەبەر ئەم هۆکارانەی لای خوارەوە:

نەمانی هەموو کێشەکانی لە بەردەم پەروەردگاردا، موسوڵمان لە نوێژەکەیدا چی غەم و پەژارەیەك بە کۆڵیەوەیەتی لەسەرشانی سوك دەبێ و چارەسەری کیشەکەی دەداتە دەست هەڵسوڕێنەری گەردوون، ئەوخوایەی کە بەبەزەیی و بە رەحمە بۆ بەندەکانی..

نوێژەکەی دەبێتە هۆی نەمانی شپرزەیی و ئاڵۆزی دەروونی بەهۆی ئەو هەڵس و کەوتەی بەردەوام ئەنجامی دەدات، وەك زانراویشە ئەو گۆڕانکارییە لە جموجوڵی نوێژدایە دەبێتە هۆی حەوانەوە بەشێوەیەکی فیسۆلۆژی گرنگ لە جەستەدا..

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی داوە بە موسڵمان ئەگەر حاڵەتی توڕە بوونی هات

بەسەردا دەست نوێژ بگرێ و دوو رکات نوێژ بکات با غەزەب و توڕەبوونەکەی نەمێنێ..

زانستییانە چەسپاوە کە نوێژ کردن دەورێکی کاریگەر و ڕاستەوخۆی هەیە بۆ سەر دەمارەکانی مێشك، هێمنی دەکاتەوە و پارێزگاری لە هاوسەنگی دەکات، چارەسەرێکی گونجاو و داواکراوە بۆ خەوزڕانێ کە بە هۆی گرژی و ئالۆزییەکانی مێشکەوە روو دەدات.

نوێژکردن گرنگترین وەسیلەیە بۆ ئارامی و حەوانەوەی دەروون و هێور بوونەوەی مێشك کە ئادەمیزاد پەی پێ بردبێ بە درێژایی مێژوو.

دکتۆر (الیکسیس کارلیل)ی فەرەنسی کە پاداشتی نۆبڵی پێ بەخشراوە لە بواری پزیشکیدا لە بارەی نوێژەوە دەڵێ: گۆڕانکارییەکی چالاکی سەرسوڕهێنەر لە کۆئەندامەکانی جەستەدا روو دەدات لە کاتی نوێژ کردندا، بەڵکو گەورەترین وزەیە بۆ چالاکی تا ئەمڕۆ زانرابێ و پەی پێ برابێ، بە چاوی خۆم دیومە ئەو نەخۆشانەی کە بە دەرمان چارەسەر نەدەکران بە نوێژکردن شیفای تەواویان بۆ دەهات لە نەخۆشییەکانیان!.

نوێژ وەك کانزای رادیۆم سەرچاوەی تیشکە و تاقەیەکی خۆییە بۆ چالاکی، بەڕاستی خۆم دیومە کە نوێژ کردن کاریگەری چاکی هەبووە لە چارەسەر کردنی نەخۆشییە جیاوازەکانی وەك: سیلی پریتۆن، هەوکردنی ئێسکەکان، برینی هەوکردو، سەرەتان..هەروەها.

خوێندنی قورئان لە نوێژدا بەڕەوانی دەبێتە هۆی رێکخستنی هەناسەدان و هەناسە وەرگرتن، ئەوەش دەبێتە هۆی کەم بوونەوەی گرژی بە پلەیەکی زۆر، هەروەها جوڵاندنی ماسولکەکانی دەم و شەویلگە لەکاتی خوێندنەوەی قورئاندا هەست کردن بە ماندووبوون کەم دەکاتەوە، چالاکی دەدات بە عەقڵ و دەیژێنێتەوە، هەروەك لە هەندێ لێکۆڵینەوەی پزیشکی تازەدا هاتووە سەجدە بردنیش دەورێکی قوڵی هەیە بۆ لەناوبردنی دڵە راوکێ و ڕاڕایی لە دەروونی موسڵماندا، هەست بەوە دەکات ئاوێژێن دەکرێت بە ئارامی و لێزمە بارانی ڕەحمەت، دڵی پڕ دەبێت لە رووناکی و دڵنیایی و یەکتا پەرستی..

خەڵکێکی زۆر لە یابان کاتێك هەستیان کرد بە ماندووبوون یان دڵ تەنگی و غەم و پەژارە سەریان دەخەنە سەر زەوی و سەجدە دەبەن بەبێ ئەوەی بزانن روکنێکە لە روکنەکانی نوێژ کردن.

# سوودەکانی نوێژ

١- نوێژ ماسولکەکانی سك بەهێز دەکات چونکە بەرگری دەکات لەو چەورییەی کەڵەکە بووە و دەبێتە هۆی خاوبونەوەی و نەمانی قەڵەوی، هەروەها ڕێگری دەکات لە شێوانی جەستە و جوانی لەش و لار دەپارێزێ.

٢- بە هەستان و دانیشتن لە نوێژدا جوڵەی ڕیخۆڵەکان زۆر دەبێ و حاڵەتی قەبزی کەم دەکاتەوە و، دەردانی زراو بەهێز دەکات.

٣- سەجدە بردن و رکوع بردن هێز دەخاتە سەر بەشەکانی پەنجەکانی هەردوو قاچ و دەبێتە هۆی کەم بوونەوەی فشار لەسەر مێشك، بە شێلانی پەنجەکانی هەردووقاچ بە تەواوی هەست بە هێور بوونەوە دەکرێت.

٤- مانەوەی زۆر لە سەجدەدا دەبێتە هۆی گەڕانەوەی فشاری خوێن بۆ تێکڕای سروشتی خۆی لە هەموو جەستەدا، یارمەتی هەڵقوڵانی خوێن دەدات بۆ هەموو بەشەکاتی جەستە.

٥- نوێژ کردن ئێسکەکان بەهێز دەکات و پشت دەپارێزی لە کۆم بوون و چەمانەوە.

٦- خشووع لە نوێژدا گەورەترین هۆکار و وەسیلەیە بۆ گەشەکردن و ئامادەیی و توانای زەین و بیروهۆشی موسڵمان.

٧- بۆ ئافرەتانی سك پڕیش وەرزش و مەشقێکی زۆر گونجاوە، ئەگەر ئافرەتانی سك پڕ ئەمەیان دەزانی ئیتر وەرزشیان نەدەکرد جگە لە نوێژکردن نەبێت، چونکە کەڵکی نەفسی و جەستەیی زۆری هەیە بۆیان وەك:

أ- بەدەست هێنانی نەرم نیانی و گونجانی زۆربەی بەشەکانی ماسولکەکانی جەستەیە، جوڵەی عەمودی فەقەری و حەوز ئاسان دەکات کە ئەوەش پارێزگارییە لە دامەزراوی جەستەو ڕێك ڕاوەستانی بە شێوەیەکی جوان.

ب- نوێژ کردن سوڕی خوێن لە دڵ و دەماغ و خوێنبەر و خوێنهێنەر و دەمارەکان چالاك دەکات، ئەمەش وا دەکات کۆرپەلە بە ئاسانی خوێنی پێ بگات بەرێك و پێکی لە ڕێگەی خوێنبەرەکانەوە، یارمەتیدەر دەبێ بۆ گەشەکردنی بە شێوەیەکی سروشتی.

ج- بەرز بوونەوەی مەعنەویات و بەدەست هێنانی متمانە و پشت بە خۆبەستن و زاڵ بوون بەسەر جەستەدا، هەروەها توانای تەرکیزی دەبێ.

# کۆتایی

زۆر سوپاسی مامۆستای مامۆستای بەڕێز و خۆشەویستم مامۆستا (حبیب محمد سعید) دەکەم کەرێنومایی زۆری کردم لەسەر نووسینی ئەم بەرهەمە و ئەرکی پێداچوونەوەی چاپی یەکەمی گرتە ئەستۆی خۆی، خوای گەورە پاداشتی ماندوبوونی بداتەوە.

سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ وَسَلَامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ.

---

# سەرچاوەکان


١- قورئانی پیرۆز.

٢- عمدة التفسير عن إبن الكثير للشيخ أحمد الشاكر دار الوفاء ١٤٢٦هجري- ٢٠٠٥میلادی.

٣- فتح الباری شرح صحيح البخاري. لإبن حجر العسقلانى.

٤- شرح صحيح مسلم لإمام النووي. دار إحياء التراث العربي ١٤٢٠هجري- ٢٠٠٠م.

٥- شرح رياض صالحين للشيخ العثيمين. مطبعة دار السلام ١٤٢٣هجري - ٢٠٠٢م.

٦- العبادة فى الاسلام. دكتور يوسف القرضاوى. طبعة مكتبة الهيثم.

٧- العبودية لإبن التيمية. المكتب الأسلام١٤٢٦هجري-٢٠٠٥م بيروت.

٨- كتاب الصلاة لإبن قيم. رقم الأيداع ١٢٣مكتبة الوطنية ١٩٨٩م.

٩- رياض صالحين به کوردی مامۆستا نوری فارس.

١٠- فقه المنهجي على مذهب لإمام الشافعي مصطفى البغا والشريجى.

١١- صحيح الترغيب و الترهيب لإمام المنذرى.

١٢- منهاج الطالبين لإمام نووى.

١٣- فضائل يوم الجمعة لامام السيوطى.

١٤- موسوعة الاعجاز العلمى في القرآن والسنة.....د. يوسف الحاج.

١٥- چەند سەرچاوەیەکی تر.

# پێڕست

# بەرهەمەكانی
# ناصح ئیبراهیم سازانی

١. فەزڵی نوێژو كاریگەریی لەسەر پەروەردەو تەزكیەی نەفس سێ جار چاپكراوە.

٢. خواپەرستی و ئاسەوارەكانی لەسەر پەروەردەی دەروون.

٣. پەروەردەی منداڵان لە ئیسلامدا نووسینی :د.عبدالله ناصح علوان وەرگێڕانی و ئامادەكردن.

٤. گەشتی قیامەت.

**بەپشتیوانی خوای پەروەردگار چاوەڕوانی بەرهەمی ترین.**